دیدێکی نوێ بۆ پاشەکشەی پرۆژەی ئیسلامی
نووسینی: دکتۆر ئیدریس کاریتانی

چاپی یەکەم ٢٠٢١ز- ١٤٤٢ك



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
دیدێکی نوێ بۆ پاشەکشەی پرۆژەی ئیسلامی،
دکتۆر ئیدریس کاریتانی (نووسەر)،
١٨١ لاپەڕە ،
١٧* ٢٤ سم ،
بابەت ، ئایینی - فکری ئیسلامی
ISBEN: 978-9922-654-00-3

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (٣٤٦) ی ساڵی ٢٠٢١ز پێدراوە.

"بیروبۆچوونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خەتی بەرگ : نەوزاد کۆیی**
**دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی**

بەرەو چارەسەرێکی گونجاو

# دیدێکی نوێ بۆ پاشەکشەی پڕۆژەی ئیسلامی



## ئاڵنگاری - هۆکار - چارەسەر


نووسینی

دکتۆر ئیدریس کاریتانی

## بەناوی خودای گەورەو میهرەبان

• خودای گەورە دەفەرموێت:﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴾ هود: ٨٨.

• پێغەمبەر دەفەرموێت: (إنَّ اللهَ يَبْعَثُ لهذه الأمَّةِ على رأسِ كلِّ مِائةِ سنةٍ مَنْ يجدِّد لها دينَها). سوننەی ئەبو داوود.

• عمری کوری خەتاب دەفەرموێت: (لا خير فيهم ان لم يقولو هاهنا، ولا خير فينا ان لم نقبل). ئیبن الجوزی لەمناقب عمری کوری خەتتاب ص ١٥٥، هیناویەتی، وە أبو یوسف پەسەندەوە لە کتابی « الخراج « ص ١٢ هێناویەتی.

## دیـــارییه بـــۆ

• ئەوانەی ڕەخنەیان وەك دیارییەك قەبوڵە.

• ئەوانەی دوعایان بۆ دەکەم و خۆشم دەوێن لەپێناو خودا، بەڵام لەبۆچون جیاوازین.

• ئەوانەی پڕ بەدڵ هەوڵی هەستانەوە و سەرکەوتن و پێشەنگی دەدەن.

• ئەوانەی خەم و بەژارەیان خزمەتی مرۆڤایەتییە بەگشتی.

• ئەوانەی دەیانەوێ پەیامێك پێشکەش بەمرۆڤایەتی بکەن پڕ بێ لە جوانی و پاکی و ئاوەدانکردنەوە و شارستانیەت.

• ئەوانەی کاری ئیسلامییان بۆ بەرزڕگراتنی ئیسلام و موسڵمانان دەوێت نەك بۆ بەرژەوەندی خۆیان.

## ســـەرەتـــایەك

سروشت کارکردن بۆ هەر ئامانجێك دوای دیراسەکردنی سەرچاوەکانی زانست و زانیاری دەگەڕێتەوە بۆ مومارەسەی ڕۆژانەی مرۆڤەکان، بەشێوازو ئالیەتی جیا جیا.

هەر قوناغ و سەردەمێکیش ئامڕاز و شێوازی جیاوازی پێویستە، تاوەکو مرۆڤەکان ژیرو داناو وشیارو ڕۆشەنبیر بن، باشتر واقیع دەخوێنەوە و لێی حاڵی دەبن، وەکەمتر هەڵە دەکەن، زوتر دەپێکن، لەگەڵ ئەوەش زۆرجار مرۆڤ سەرکەوتو نابێ، بەڵام وەك سوننەی ئیلاهی هەتا مرۆڤ دەست بەیاساکانی ژیان بگرێت زیاتر ئەنجامی دەبێ و سەردەکەوێ. مرۆڤ بەگشتی وەك سروشتی خۆی هەڵە دەکات[1]، تەنها پێغەمبەران نەبن، (سەلامی خودایان لەسەر بێ). کاری سیاسیش هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ کارەکانی تر، بەڵکو فراوانتر و ئاڵۆزترە! بەتایبەتی لەجیهانی ئەمڕۆ، هەنگاوەکانی کاری سیاسی پێویستی بەزانیاری و زانستی کۆمەڵناسی هەیە.

چونکە کاری سیاسی گۆڕانکاریە لەنێو کۆمەڵگا ، لەجوگرافیای کوردستان گۆڕانکاری لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا بەبێ شارەزایی ورد لەزانستی کۆمەڵناسی (علم الاجتماع) ناکرێت، . ئاڕاستە سیاسیەکان بەگشتی هەوڵی گۆڕانکاری لەکۆمەڵگا و پێشکەشکردنی جوانترین ئیدارەدان و پڕۆژەی حوکمداری دەدەن، بۆ خزمەتکردنی گومەڵگا و دام و دەزگا خزمەتگوزارییەکان، لەم سەد ساڵەی دوایی، لەدوایی نەمانی خەلافەتی ئیسلامی، بیرمەندو سیاسەتمەدارەکانی جیهانی ئیسلامی هاتنە مەیدانی ململانی سیاسی، وەك بەدیلی تەواوی بیردۆزە مرۆڤکردەکان خۆیان دەرخست، هەوڵی گەیشتنی دەسەڵات و حوکمیاندا، لەم سەد ساڵەدا چەند جارێك گەیشتنە لوتکەی دەسەڵات، وەك شەهید دکتۆر محمد مورسی لەمیصر، هەندێ

---

(١) كلُّ بَني آدَمَ خَطَّاءٌ، وخيرُ الخطَّائين التَّوابُون. ئیمامی احمد گێرایتیەوە، بەژمارە (٧٢).

جاریش بەشداری کارایان هەبووە لەنێو کایەکانی حکومەت و دوایی پاشەکشەیان پێ کراوە، وەك ئێستای تونس و مەغریب، کاتێك سەرکەوتن بەدەست دێنن کەمتر دەکەونە بەر ڕەخنە و تێبینی، بێگومان لەکاتی شکست و پاشەکشە ئەو کات ڕەخنە و تێبینی و پێشنیار و بەخۆداچونەوە بەتوندی بەرۆکی پڕۆژەو کاری ئیسلامی و کاراکتەرەکانی دەگرێت، ئەمەش کارێکی ئەرێنی و سود بەخشە، نیشانەی زیندویی و وشیاری بیرمەندو گومەڵگا و تاکەکانە، هەوڵدانە بۆ پێشکەشکردنی جوانترین نمونەی سیاسەتکردن و دەسەڵات و حوکم و دادگەری.

پێـــوەر چـــیە؟!!!

لە ئێستادا بەشداری کردنی هەڵبژاردن و کورسییەکانی پەرلەمان بونەتە جۆرێك لەپێوەری پێشکەوتن و پاشەکشەی پڕۆژە و کاری ئیسلامی، هەرچەندە کارو پڕۆژەی ئیسلامی فراوانترە و لەوەندە قەتیس نەکراوە، بەڵام چونکە سیاسەت و دەسەڵات و حوکم وەك چەتری بەشەکانی تر وایە، بۆ مانەوە و پاراستن و خزمەتکردنی زیاتری گومەڵگا، بەپێوەری سەرەکی دادەنرێت، کاتێك لەڕوی سیاسەت و دەسەڵات و حوکم بەرەو پێش چوی، ئەوا بانگەوازو پەروەردە و فیرکردن و تەنانەت دیاردە کومەڵایەتی و ئەخلاقیەکانیش لەپێشن، پێچەوانەکەشی بەپێچەوانەوەیە، لەم دواییانە بەپێی ڕێژەی بەشداری بەشی زۆری کورسیەکانی حیزبە ئیسلامیەکان کەمی کردوە، لە ساحەی سیاسی پێگە و سەنگایان زۆر لاواز بوە، موتمانەی گەیشتنە دەسەڵاتیان لەلای جەماوەر لاواز بوە. بۆیە ئەوانەی لەناو حیزب، یان لەدەرەوەی حیزب، وەك بیرمەند و موحلیلی سیاسی و ڕۆشەنبیران و سیاسەتمەدارەکان هەوڵی چاکسازی بارودۆخەکە دەدەن، پڕۆژەو پێشنیار پێشکەش دەکەن، تا لەم چوارچێوە تەکانێك بەکاری ئیسلامی بدرێت، هەڵەکان ڕاست بکرێنەوە، لە داهاتو ببێتەوە پێشەنگ، خاوەنداریەتی کەیس و پڕۆژەی چاکسازی و بابەتە ئایینی و نەتەوەیی و نیشتیمانییەکان بکات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویێت: (إنَّ اللهَ يَبْعَثُ لهذه الأمَّةِ على رأسِ كلِّ مِائةِ

سنةٍ مَنْ يجدِّد لها دينَها)[١]. ویستی خوداش لەسەر ئەوەبوە کە زۆرینەی دەقەکانی قورئان وسونەت زەنی و دەلالە بن، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان دەوری تێرامان و عەقڵ بەکار بهێنن، هەروەها تەرتیبی ئەولەویات (ترتیب الاولويات)، و (تحقيق المصالح)، وەدەست هینان پەرژەوەندیەکان و (درء المفاسد)، دورخستنەوەی فەساد بەپێی تاقە و توانا و پێکرانە، ئەمانە هەموو وایان کردووە نویگەری و بەخۆداچونەوە و ڕەخنە لەخۆگرتن لەهەڵەکان ئاسایی و بەردەوام بێت، بو ئەم مەبەستە بەپێویستم زانی ئەم نوسراوە وەك پڕۆژەیەك لەچوار چێوەی دڵسوزی و هاوپیشەیی و هاوخەمی و بەرپرسیارییەتی خۆم پێشکەش بکەم، لەسەر داهاتوی پڕۆژە و کاری ئیسلامی و خاڵی لاواز و کەموکوری و پاشەکشە و گرفت و ئاڵنگاری و چارەسەریەکانی، هەروەها هەنگاوی داهاتوو چۆن دەبێ، بەئومیدی ئەوەی ئەمەش ببێتە خشتێك بۆ بیناکردنی بینایەکی تەواو، لە پڕۆژەو کاری ئیسلامی و کاروانەکەی.

## خۆمان بەقەرزاری ڕابوونی ئیسلامی دەزانین!!!.

گومان لەوەدانیە پڕۆژە و ڕابوونی ئیسلامی فەزڵی بەسەر هەمووما نەوە هەیە، خەڵکی کوردستانی لە قوناغێکی ڕاگوزەری فکری لاواز بردە قوناغێکی نوێی نەهزەوی و فکری و سیاسی ڕاست و تەندروست، هەرچەندە کوردستان لەڕوی کاروانی ڕابوونی ئیسلامی بەهۆی نەبونی کیانی سەربەخۆ و، مەوقیعە جوگرافیەکەی زۆر لە دواوەی جیهانی ئیسلامی بوو! هەڵکەوتەی کوردستان لەڕوی جوگرافییەوە هەڵکەوتەیەکی پەیوەندیدارە، تێکەڵ بەسنورەکان بوەو خۆی لەگەڵ بەشێکی وڵاتانی روژهەڵاتی ناوەراست بەستاوەتەوە، بەهۆی ئەم هەڵکەوتە جوگرافیەوە تاکەکانی دەتوانن بەئاسانی ژیار و شارستانیەت و ڕۆشەنبیرییان لەگەڵ وڵاتان تێکەڵ بکەن، بەڵام چونکە بۆ ماوەی سەدەیەکە کوردستان دابەش کراوە بەسەر وڵاتان و ژێر دەستە و داگیرکراوە، تاکەکانیشی هاموشۆ و هەنگاوەکانیان سنور دار کراوە، نەیان توانیوە بەوڵاتان دا بگەڕێن و ئاڵوگۆڕی فکری و ڕۆشەنبیری و

---

(١) بڕوانە: سونەنی ئەبو داوود، ژمارە، (٤٢٩١).

فکری سیاسی بکەن، بەڵام لەدوای سەرهەڵدانی ڕابوونی ئیسلامی خەڵکی هەرێمی کوردستان بەگشتی و خەڵکە مولتەزیمەکە بەتایبەتی، ئاشنا بون بە ئیسلامی راستەقینە و سیستەمە گشتگیرەکەی، زانیان کە ئیسلام تەنها بواری عیبادات نیە، بەڵکو ئیسلام: دین و ژینە، شەریعەو یاسایە، روح و جەستەیە، دەعوەو جیهادە، مادی و مەعنەوییە، سیاسەت و دەوڵەتە، ئابوری و کومەڵایەتیە. سیستەمی تەواوی ژیانە بۆ مرۆڤایەتی، ئەم تێگەیشتنە هەڵانەی، کە لە ئەنجامی سەد ساڵی ڕابردو بەهۆی نەمانی خەلافەتی ئیسلامی بڵاو بوو بۆوە و بەدین دادەنرا ڕاستکرایەوە، کۆمەڵێك عادات و تەقالیدی ناشەرعی و خوڕافیات تێکەڵ بەئیسلام کرابو لادرا، لەشوێنیدا خەڵك بەبنەما جوانەکانی ئیسلامی ڕاستەقینە شارەزا بوو، بەتایبەتی لەبوارە ئیمانیەکان، زانرا کە ئیسلام سیستەمێکی گشتگیری سیاسی، فکری، فەرهەنگی، فەلسەفی، ئابوری، کومەڵایەتی و پەروەردەیی و فێرکردنە. هەروەها گۆمەڵگا بەهەندێك چەمکی جوانی ونبو ئاشنا بوو، فکرە لادەر و مونحەریفەکانی عەلمانیەت و شوعیەت و لیبراڵیەت بەخەڵك ناسێندرا، پەردەی لەسەر فکری هاوردەی عەلمانی لادا، بەخەڵکی هەرێمی کوردستان و میللەتی کوردی گوت، کە عەلمانیەت موزەیەفە و هیچ پەیوەندیەکی بەکوردەوە نییە، ئەو نەهامەتی و ژێر دەستەییەی بەسەر کورد هاتوە هەمووی لە ڕێی عەلمانیەتەوە بوە، دەکرێ کورد بەسیستەمی ئیسلامی لەژێر دەستەیی ڕزگاری ببێت و ببێتە خاوەن کیانی خۆی، ئیسلام پارێزگاری لەکیان و ناسنامەکەی دەکات، میللەتی کوردی بەوە ئاشنا کرد کە لەڕێی سەرکردەی جیهانی (صلاح الدین ئەیوبی) دەستی باڵای هەبوە لە خزمەتکردنی ئیسلام و مێژووی پڕ سەروەری تۆمار کردوە. ئێستاش بۆ ناسینەوەی شوناسی کوردایەتی، لە وڵاتانی رۆژهەلات و تەنانەت جیهانیش بە نەوەی صلاح الدین دەناسرێتەوە.

سەرەڕای هەموو ئەوانە ڕابوونی ئیسلامی بوە هۆکار، بۆ جارێکی تر داڕشتنەوەی پەروەردەی تاك و خێزان بە ناسنامەیەکی ئیسلامی و پاراستنی ئەخلاق و بەهای بەرزی دینداری، لەگەڵ سەدان خاڵی ئیجابی جوان و پڕ بەهای کۆمەڵایەتی، بۆیە هەمومان قەرزداری ڕابوونی ئیسلامین. بەڵام نابێ ڕابوونی ئیسلامی بەشەخسی بکرێت، کەس تەنها بەهی خۆی بزانێ و بیکاتە میرات، چونکە ڕابوونی ئیسلامی

بەرهەمی هەمو تاکەکانە، بەهەر شێوازێك بێت لە خزمەتی دا بووە، هەر کەسە و بەپێی هەوڵ و بواری خۆی دەوری تێدا بینیوە.

زۆر جار بۆ ناسین و گەورەیی ڕابوونی ئیسلامی پێویستە لە بەرامبەرەکان ڕامینێین، بزانین چۆن دەمان خوێننەوەو چ جۆرە حیسابیکمان بۆ دەکەن، ڕابوونی ئیسلامی جێگای ترس و دڵەراوکێی هەمو نەیارەکانی بوە، بە بەڵگەی شەهید کردنی شێخ حسن البنا وە بگرە، تا ئەمرۆ ، گاڵتە نیە دەزگای موخابەراتی ناوەندی ئەمریکی لەیەك ساڵیدا لەساڵی (١٩٨٣) پاڵپشتی دارایی بۆ زیاتر لە (١٢٠) گۆنگرەی کردووە تەنها لەسەر کاریگەری ڕابوونی ئیسلامی[١] ئەمە بەڵگەیەکی ڕون و ئاشکرایە کە ڕابوونی ئیسلامی چەندە گرنگە.

---

(١) بڕوانە : گۆڤاری (المستقبل العربي) ژمارە (١٠٨)، وتاری محمد حسين هيكل، بەناونیشانی (هواجس مستقبلية) لەزانکوی قاهیرە پیشکەش کراوە.

# ڕێخۆشکردن

هەموو کارێکی سیاسی بە دەرنییە لەگرفت و هەوارزو نشێو، بەرزی و نزمی، هەڵکشان و داکشان، واتە کاری سیاسی بەکومەڵێك گرفتی ناوەکی و دەرەکی گیرۆدەیە، بۆتە ڕێگر لەبەرەو پێش چون و گەشەسەندنی، بۆ هەر گرفتێکیش چارەسەر هەیە، تا لەوەیوە دەست لەسەر برینەکان دابنێین و چارەسەری بۆ بدۆزینەوە، هەر چەندە هەر تاکێك کاتێك دەیەوێ باسی لاوازی و پاشەکشەی کاری ئیسلامی بکات، لە دیدگای خۆی گرفت و چارەسەرەکان دەبینێ، مەرج نییە هەموو کەسەکان هەمان خویندنەوە و دیدگایان هەبێ، بەڵام هەندێك خاڵی جەوهەری هەیە هەمو تاکێك و بیرمەندێك هەستی پێ دەکات.

بۆیە پاشەکشە و خاڵە لاوازەکان دەکرێ بڵێین گشتی و جوزئیاتن، وە دەرەکی و ناوەکیشی هەیە، هەر کات خاڵە لاوازە گشتییەکانت چارەسەر کرد، جوزئیات بە سروشت چارەسەر دەبێت و بەدوایان دادێت. خاڵە دەرەکیەکانیش کە لەتوانای تۆ نیە چارەسەریان بکەی!!! دەبێ تەنها نەخشە ڕێگایان بۆ دابنێی کە چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەی، چونکە چارەسەریان لە دەستی ئێمە و لەتوانای ئێمەدا نییە، بۆیە لەم کتێبەدا ناچمە سەر خاڵی جوزئی و ڕۆتینیات، بەڵکو ڕاستەوخۆ باس لەگرفت و ئاڵنگاری و کێشەکان دەکەین، دواتر دێینە سەر چارەسەریان، بەپێی دیدگاو تێگەیشتن لەم بارودوخەی ئێستا توانی کەسیم دەخەمەڕو، هەوڵ دەدەم هیچ حیزب و گروپ و کەسێك لە هەرێمی کوردستان بە دیاری کراوی ناو نەهێنم، لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی گشتی چاکسازی و بەخۆداچونەوە و دیاری کردنی خاڵە لاوازەکان بەگشتی بمێنێتەوە، تانە لەکەس نەدەین، هیچ پرۆسە و کارێکی ئیسلامیش لەکەدار نەکەین، کارەکانیان بەکەم نەگرین، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ ﴾[1].

---

(١) سورەتی الشعراء: ١٨٣.

## قسەکردن لەسەر پاشەکشەو خاڵە لاوازەکان بۆ؟

ڕەخنە کردن کارێکی ئاسان و ساکار نییە، بەتایبەتی لە دونیای ئەمڕۆی عەولەمە و ململانێ جیهانی و سیاسەت و شەڕی پەرژەوەندی خوازان لەپەنای سیاسەتکردن، هەروەها خویندنەوە بۆ کاری سیاسی و دیاری کردنی خاڵی لاواز لەپارتە سیاسیەکان، بێگومان کارێکی زۆر ئەستەمەو بویری و شارەزایی وردی دەوێ، بەڵام ڕەخنە گرتنێك نیازپاکی تێدا بێت و مەبەست و ئامانج تێیدا بونیاتنان و هەستانەوەو هەوڵدان بێ بۆ چارەسەری، دەبێ بەرز بنرخێندرێت، لای ئەو کەسانەی لەوتە جوانەکەی قائید و پێشەنکی سیاسەتمەداران عمری کوری خەتاب تێدەگەن، کە دەفەرموێت: (رَحِمَ الله امرَأً أهدى إلي عيوبي)[1]، رەحمەتی خودا لەم کەسە بێت هەڵەکانم بەدیاری پێدەدات، وشەیەکی گەورە، مانایەکی فراوان، بناغەیەکی بەهێز بۆ ئەو کەسانەی تێدەگەن، دەیانەوی پێبگەن و خاوەنی بیرۆکەو پەیامی بەرزو گەورەن، لەکاتی گەیشتن بەم ڕەخنە و کەموکوڕیانە ئارام دەگرن، ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾[2].

هەرچەندە ئەمڕۆ پێوەرەکان شلەژاون و بەشێك لە حیزب و کەسایەتییەکان ئاسان نییە قبوڵی ڕەخنە بکەن، یان پاساو دەهێننەوە، یان بەلای کەم خۆیان پێ لە هەموو کەس شارەزا تر دەبینن، یان خۆ بەگەورە زانین نایەڵی دان بەهەڵەکان دا بهێنن!!! یان بەرژەوەندی لەوە دایە کارو پرۆژەی ئیسلامی لەهەرێمی کوردستان بەم هەڵانەدا بڕوات! بۆیە زۆر پێ دڵگران و نارەحەت دەبن، بەڵام ئەمانە نابێ ببێتە ڕێگری لە دیاری کردنی هەڵە و خاڵە لاوازەکانمان، چونکە قسە لەسەر ئەم بابەتە بەکاری شەرعی و بەشێك لە دینداریمان دەزانین، خۆشمان بێ پەڵە نین و بەشێك لەم هەڵانە دەکەوێتە سەر شانی ئێمەش.

---

(١) بڕوانە: احياء علوم الدين، ئیمامی غەزالی : (ج٣- لا٦٤٧).

(٢) سورەتی فصلت: ٣٥.

هەر چەندە ئەم نوسراوە کاتەکەی درەنگە، دەبو زوتر خاڵەکانی دیاری بکرابایە، چونکە ساڵانێکە پڕۆژەو کاری ئیسلامی لەکوردستان توشی لارو لەوێری بوە، خاڵی لاوازی تێکەوتوە، پێویستی بەچاکسازی و پاکسازی ڕیشەیی هەیە، بەڵام ئێستاش دیاری کردنی لەبازنەی پێویستی ئەم سەردەمەیە، دەکرێ لە خاڵە لاوازەکان دوربکەوینەوە، لە شوێنی ئەوان خاڵی ئیجابی و بەهێز لە شوێنی دا پەیڕە و بکەین، لەکاتێکدا عەلمانییەت لەکوردستان توشی شکستی زۆر گەورە بوە، ناتوانی لەبوارە فکریەکەی قەناعەت بەتاکەکانی کومەڵگا بکات، سەرەڕای ئەوەش بەشێکی زۆر لەسەرکردە سیاسیەکانی بڕوایان بەفکری عەلمانی نەماوە، زیاتر لەچوارچێوەی پەرژەوەندی و وەرگرتنی کورسی و دەسەڵات دەسوڕێنەوەو بانگەشەی فکری عەلمانی دەکەن، لەلایەکی ترەوە عەلمانیەت نەیتوانی پرەنسیپەکانی خۆی سەربخاو لەگەڵ مەبدەئی خۆی ڕاست بکات، لە شاخ بانگەشەی ئیشتراکیەتیان دەکرد، دژی سەرمایەداری بون، کەچی ئێستا هەمو سەرکردەکانی سیاسی و فکری عەلمانی سەرمایەدارن، پیچەوانەی بانگەشە و فکری خویانن، لەڕوی نیشتیمان پەروەریەوە زۆربەیان لەم چەند ساڵەی دواییدا خیانەتیان لەگەڵ نیشتیمان کرد و دەستی دوژمنیان ڕاکێشا، سەرەڕای گەندەڵی و بەهەدەر دانی ماڵ و سامانی گشتی، ئەمانە هەمویان پێچەوانەی پرەنسیپەکانی عەلمانیەتن، ئەم خاڵە لاواز و سلبیانە لەعەلمانیەت دەرفەت زیاتر دەڕەخسێنی بۆ بەهێز بونی پڕۆژە و کاری ئیسلامی و موتمانەی خەڵك، بەڵام بەداخەوە ئەمانە سوودیان لێ وەرنەگیرا، ڕۆژ بە ڕۆژ ئێمە بەرەو لاوازی دەچین.

دیارە نوسراوی زۆر لەم بارەیەوە بەشێوازی جیاجیا پێشکەش کراوە، بەڵام بەڕای بەندە ئەمەیان کەمێك جیاوازە، چونکە خاڵەکانی بە شێوازی خاڵبەندی و گوشراوی و وردەکاریەوە تەنانەت بەدیدێکی تازەو واقیعیانە پێشکەش کراوە، واتا کەمێك دورکەوتۆتەوە لەنەزەریات، زۆرتر خاڵە لاوازە مەیدانییەکانی دیاری کردوە، تاکو خوێنەر بەچاو خشانێك بەشێکی زۆری کەموکوڕی و خاڵی لاوازی ئیستای کاری ئیسلامی بو دەر بکەوێ، مەرجیش نیە ئەم نوسراوە هەموو لایەنەکانی خاڵی لاوازی لەخۆ گرتبێ، بەڵام لانی کەم خاڵە سەرەکی و ئەساسیەکانی خاڵبەند کردوەو کۆی کردونەتەوە، بۆ هەر خاڵێکی لاواز، چارەسەرێکی سەرەتایی و کورت باسکراوە.

## نیازپاکی و پێوەرێکی سەرەتایی:

پشت بە خودا لەم نوسراوە هەوڵدەدەم بەپێی تواناو بەئەمانەتەوە، زۆر بەئینصاف و نیازپاکی خاڵی لاواز و کەموکوڕی پڕۆژە و کاری حیزبی سیاسی ئیسلامی بە شێوازێکی کورت و پوخت، بە خاڵ دیاری بکەم، زیادەڕەوی و کەم تەرخەمی تیدا نەکەم، وە مەیلی دڵی خۆمیشی لێ دور خەمەوە، تاکو لە چوارچێوەی نوسراوێکی پاك و نیازێکی شەریفانە دا بیت و کەس گومانی پێ نەبات، وابزانی تانە لەکەسێك درابێ، یان لایەنێکی دیاری کراو لەکەدار کرابێ، بۆیە هەر لەسەرتاوە بڕیارم دا ناوی هیچ کەسایەتی و حیزب و گروپێکی ئیسلامی نەهێنم، سوێند بەخودا ڕۆژانە لەکاتی زۆر هەستیار، زۆر جاران لەسوجدە یان لەکاتێك کارێکی خێرم ئەنجام دابی پاڕاومەتەوە پڕ بەدڵ، خودایە بەرەکەت بخەیتە ئەم نوسراوەم، ببیتە دەرگای خێر بۆ موسڵمانان، تاخاڵەکان وەك دیاری کردنی خاڵی لاواز گشتی بن، لەهەر کات و سات و زەمانێك ستاندەر و پێوەر بن بۆ پڕۆژەو کاری سیاسی ئیسلامی، وەك پێوەرێکی بەخۆداچونەوە و تەکانێکی بەرەو پێشچوون و موراجەعەیەکی هەمەلایەنە بێت[1].

د. ادریس کاریتانـی، ٧-١٠-٢٠١٩.

عمان - الاردن.

---

(١) ناوی پڕۆژە و کاری سیاسی ئیسلامیمان بۆیە لێرە بەدیاری کراوی هێناوە، چونکە قسە لەسەر کاروانی سیاسی ڕابوونی ئیسلامی ئەم سەردەمەیە، ئەگەر نا خاڵەکان بەشێکی زۆریان بو هەر کارێکی سیاسی و حیزبی دەشێ و گونجاوە.

## دەرفـــەتی زێـــڕیـــن

ئەو دەرفەتانەی لەبەردەستمان بوون نەمان قۆستەوە.

لەدرێژەی (٢٩) ساڵی حوکمڕانی، دوو حیزبی دەسەڵات هەرچی ئینتیماو نیشتیمان و خاك و خەڵك بوو لەدەستیان دا، ئەو بنەما فکریانەی حیزبیان لەسەر دامەزراندبوو بەکردار گشتیان هەڵوەشاندەوە، لەفکری مارکسیەتەوە بگرە، تا دەگاتە کۆمەڵەی ڕەنجدەران، سۆشیال دیموکرات، و دژە سەرمایەداری، دیموکراسی، قەومیەت، نیشتیمانن مەبدەئو بابەتەکانی پەیوەند بەم کەیسە لەژێر دەسەڵاتی ئەم دوو حیزبە بەتەواوی شکستی هێنا، خراپترین حوکمڕانیان پێشکەشکرد لە دونیادا وێنەی نییە، ئابوری هەرێم داڕوخاوە، ململانیەکی قوڵی بە بنەماڵەکردن هەیە، گەندەڵی لە نێوان ئەم دو حیزبە دەستی پێ کرد، بەم شێوازە حوکمڕانییە گەندەڵە هێزی جەماوەریان لەدەست دا، ڕێژەی دەنگدەری ڕاستەقینەیان زۆر دابەزی، خەڵك بەتەواوی بێزاری خۆی لەم دەسەڵاتە دەربڕی، لەم نێوەندەدا ڕابوونی ئیسلامی، خیانەتی نیشتیمانی نەکردو دەستی تێدا نەبو، هەروەها گەندەڵی نەکردو بەشدار نەبو، ئەگەر خاوەنی پڕۆژەی درێژخایەن بوان، ئەوا خەڵك ئاسانتر ڕوی لە پڕۆژە و ڕابوون و پڕۆژەی ئیسلامی دەکرد و متمانەی پێ دەکرد، بەگشتی ئاڕاستە ئیسلامییەکە لەڕووی کاری خێرخوازی سەرکەوتوە، خەڵك و بەشێك لە عەلمانیەکانیش بڕوایان پێ دەکەن، بەڵام نەتوانراوە لەڕووی سیاسەت و حوکم و ئیدارە و ئاوەدانکردنەوە جێی موتمانەی خەڵك بن، لەکاتێك دا ئەم (٢٩) ساڵە ئەم دەرفەتە زێڕینانە لەبەر دەست دابوو:

١- شانازیان بەشۆڕشی شاخ دەکرد، ئێستا شتێك نەماوە بەناوی شۆڕش و شاخ، دوو حیزبی دەسەڵات هەموویان کردە کاری شەخسی. ڕابوونی ئیسلامی شۆڕشی شاخی دژی بەعسی کرد، دەبو لەم شلەژانە خۆی بکردایە، بەخاوەنی ئەم بابەتە.

٢- جاران لەشاخ خاوەن بانگراوندی فکری بون بەناوی ( دیموکراسی، شۆسیال دیموکرات، کۆمەڵەی ڕەنجدەران، شوعیەت)، ئێستا کارەکانیان بەتەواوی پێچەوانەی

فکرەکانیانە. بۆشاییەکی گەورەی فکری دروست بوە بۆ رابونی ئیسلامی ئەگەر خاوەن پڕۆژەی فکری بوایە.

٣- لە شاخ دژی سەرمایەداری و بۆرجوازیەت بون، ئێستا گشتیان سەرمایەدارن، کار بۆ بورجوازیەت دەکەن.

٤- قەومیەت و نیشتیمانی هیچ باوی نەماوە، دەسەڵات هەموی بەتەواوی ناشرین کردوە، ناتوانی وەك کەیس باسی بکات.

٥- گەندەڵی بنکۆڵی ئەم دەسەڵاتەی کردوە، گەورەترین دەرفەت بوو بۆ ڕابوونی ئیسلامی.

٦- لە٪ ٩٥ی خەڵکی کوردستان موسڵمانە، تەواوی بنەما ئیسلامیەکانی وەك نویژ و رۆژ و حەج و زەکات جێبەجێ دەکات. ئەمە یارمەتی دەرە بۆ کاری سیاسی ئیسلامی، وەك کۆمەڵگای جەزیرە و قورەیش پەیکەر پەرست نین.

٧- کۆمەڵگای کوردی لەڕووی کلتوری کۆمەڵایەتیەوە تەواو پابەندە بەکلتوری ئیسلامی، ئەمەش خاڵێکی تری یارمەتی دەرە.

٨- کۆمەلگای کوردی لەڕووی باری کەسیەوە تەواو پابەندە بە بوارەکانی، (الاحوال الشخصية).

٩- لەڕووی یاساییەوە هیچ مادەکی یاسایی نییە پەرلەمان تەبەنی کردبێ و دژی یاساکانی ئیسلامی بێ. واتە زۆربەی بنەماکانی کۆمەڵگا لەسەر یاسای باری کەسی عێراقیە، کە لە مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفە وەرگیراوە.

١٠- وڵاتی تورکیا و مالیزیا بەشێکی مەغریب و تونس، بەیاسا عەلمانی بون، زۆربەی یاساکان دژی ئیسلام بو، توانیان بیگۆڕن، کوردستان هیچ یاسایەك نیە عەلمانی بێ، نەتوانراوە ئەم دەرفەتە یاساییە بقۆسرێتەوە.

١١- عەلمانیەت وەك فکرە بەتەواوی شکستی هێناوە لەکوردستان و لەجیهانی ئیسلامی، دەرفەت هەبو، ڕابوونی ئیسلامی لە بری فکری عەلمانی فکری ئیسلامی تەبەنی بکردبایە.

١٢- خەڵکی کوردستان لەسەرەتای هاتنی ڕابوونی ئیسلامی بەماڵ و منداڵ و کەس وکارو گیانەوە باوەشی بۆ ئەم ڕابوونە کردەوە، (خزمێکمان هەبو ناوی حاجی مامەند بو، لە نەکسەی ڕابوون هەرچی ماڵی هەبو لەگەل سێ کوڕی بەناوەکانی (ف- ن- ص) هێنا بۆ ناو ڕابوونی ئیسلامی، کەچی بەشێك لە سەرکردە ئیسلامیەکان خۆیان بەڕابوون دەوڵەمەند کرد، ئیستاش سەروەتێکی زۆریان هەیە، هەر لەسەر ئەم ڕابوونە، بەڵام لەبەر نەبونی عەدالەت و خەت خەتۆکێی نیو خۆ، نەتوانرا سود لەم دڵسۆزیەی خەڵك ببینن.

١٣- عەلمانیەکان شکستیان هێنا لە بانگەشەی دیموکراسی، مانایەك بۆ دیموکراسی نەماوە، چونکە دەسەڵاتیان کردە بنەماڵەیی.

١٤- کوردستان زیاتر لە (٥) هەزار مزگەوتی لێیە، ئەمەش باشترین پاڵپشتی پەیامی ڕابوونی ئیسلامی بو، زۆربەی وتار و ئاراستەکان لە خزمەتی ڕابوونی ئیسلامی بوو.

١٥- بە هەزاران مامۆستای ئایینی و بانگخواز هەبو لەگەڵ خیتابەکەی ڕابوونی ئیسلامی دەهاتەوە.

١٦- زۆربەی بنەماکانی حەڵال و حەڕام لەنێو کۆمەڵگای کوردی پەیڕەو دەکرا، پاڵپشت بون بۆ ڕابوونی ئیسلامی، دژ بون بەعەلمانیەکان.

١٧- ئەگەر بەشەکانی شەریعەت دابەش بکەین لەوانەیە ٪١٠ ی پێك هاتبێ لە حوکم و قیصاص و حدود و ئەمانە، بەشەکەی تری بەهاو ئەخلاق، ڕاستی، بەڵێن، کڕین و فرۆشتن، سیلەی ڕەحم، باری کەسی، ژن و ژن خوازی و مەراسیمەکانی، بەتەواوی لەنێو کۆمەڵگای کوردی پەیڕەو دەکرا، زۆر جیاواز بوو لەکۆمەڵگایەکی جاهیلی، ئەمانەش گشتی لە خزمەتی پڕۆژە و ڕابوونی ئیسلامی دا بوو.

١٨- هەمو خیتابێکی سەرکردە سیاسیە ئیسلامیەکان ئایەت و فەرمودەی لەگەڵ دەگوترا، واتا خیتابەکەی بەهێز دەکرد، خەڵك زیاتر گوێی بۆ دەگرت. بەپێچەوانەی فکری شوعیەت، کە دژ بوو بە هەموو کلتوری کوردەواری.

١٩- بەشی زۆری عادەت و تەقالیدی کوردەواری لەسەر مەفهومە فیقهیەکان دارێژراوە، تەنانەت لەدێیەکانیش .

٢٠- خیتابی (ئیسلام ژیانە) لەلایەن ڕابوونی ئیسلامی تازە بو بۆ کۆمەڵگای کوردی، ئەگەر پێداگری لەسەر بکرابایە و بەکردار جێبەجێ بکرابایە دەبوە بابەتێکی گرنگ.

٢١- یەك مەزهەبی سونی بونی کۆمەڵگای کوردی هەر لەخزمەتی ڕابوونی ئیسلامی بوو.

لەگەڵ دەیان خاڵی زێڕینی ئیجابی و گونجاو بۆ پرۆسەی کاروانی ڕابوونی ئیسلامی، دەکرا سودی لێ وەربگیرێ، خاوەنداریەتی بکرێ، ئەگەر بەپێوانەی کافرەکانی قوڕەیش و سەنەم پەرستی و جەهالەتی جەزیرەی عەرەب لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) قیاس بکەین، دەرفەتی ئێمە زۆر زیاتر بوە لەو سەردەمە. بەڵام دەرئەنجام و نەتیجەی لاوازە و وەك پێویست نییە.

## بۆ نەگەڕامەوە بۆ باسی مێژوو:

وەك عورفێکی نوسین زۆربەی نوسراوەکان باسێکی کورتی مێژووی بابەتەکە دەکەن، بەڵام بەندە بۆیە نەگەڕامەوە بۆ باسی مێژوو تانوسراوەکە درێژدادڕ نەبێت، وە بۆ ئەوەی تەرکیز زیاتر لەسەر ئێستاو داهات و بێت، تاخوێنەر بێ تاقەت نەبێ لە خوێندنەوە، هەروەها لەگەڵ مێژو نەژی، وەبیری لەسەر گرفتەکان بێت، ڕو لە چارەسەرەکان بکات، وەك براکتێزە کردن، دوربین لەنەزەریات، چونکە نەزەریات زۆر زۆرە، کەمتر بڕژاوینەتە سەر پراکتێزە و عەمەلی، دەکرا بەئاسانی بگەڕێمەوە بۆ مێژو کورتەیەك لەکاری ئیسلامی باس بکەم، لەگەڵ باسکردنی کۆمەڵێك بابەت دەبو بورژێنم ، وەناوی هەندێ کاراکتەری سیاسی باس بکەم، بریارم داوە کەس لەکەدار نەکەم، ناوی کەسیش نەهێنم، بۆیە نەگەڕامەوە بۆ مێژووی سەرهەڵدانی کاروانی پیرۆزی ڕابوونی ئیسلامی، لەلایەکی تر لەوانەیە بۆ دیاری کردن و چارەسەری گرفتەکان سودمان کەم لێی دەبینی.

## هەڵسەنگاندن و ڕەخنە گرتن لەتەراوزی شەریعەت

چۆن قبوڵی ڕەخنەی زاتی بکەین!!!.

وشەی ڕەخنەی زاتی لەناوەندە ئیسلامیەکە، تا ڕادەیەك قبوڵکراو نییە و بوغزێندراوە، بەهەر بەهانەیەك بێت، ئەم وشەیە ئیسلامی نییە! یان تانەیە لە پڕۆژەو کاری ئیسلامی! یان خیانەتە لەکاری پیرۆزی ڕابوون! یان وشەیەکە بەکاردێت لە لایەن خەلکانێکەوە بەم کارە ماندو نەبون ئێمە ماندوبوین! یان ئەوان لەناو واقیعەکە نین ئێمە باشتر دەزانین! ...هتد، هەندێ جار کاری تاکەکان تێکەڵ دەکەن بەڕاستی و تەواوی ئیسلام و پەیامەکەی، دەیکەنە بەڵگە تا ڕەخنەی زاتی نەگیرێ! لەگەڵ دەیان قسە و بۆچونی تر بۆ ڕێگرتن لەڕەخنەی زاتی، گرنك ئەوەیە هەڵەکە لەخۆی دور خاتەوە بیخاتە سەر یەکێکی تر، لەکاتێکدا ئەگەر ڕەخنە گرتن لەخودی خۆت واتای پێداچونەوە و ڕەخنە لە دەرون و کاری تاکی خۆت بێ، قورئان و سونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پڕە لەم جۆرە ڕەخنانەی لە زاتی خۆیان گرتوە، بەپێغەمبەرانیشەوە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾[1]. ئەم ئایەتە لێپرسینەوە و پێداچونەوە و ڕەخنەی زاتیە. یەکەم مرۆڤ لەسەر زەوی کە ڕەخنەی زاتی گرت و کردیە بنەمای ستراتیجی بۆ هەستانەوە، ئادەم (علیه السلام) و خێزانەکەی بون، دانیان نا، فەرمویان: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾[2] ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٣٧ ﴾[3]. لەبەرامبەردا ئەوەی توشی لەعنەت و دورخستنەوە بو، شەیتان بو، ڕەخنەی زاتی قبوڵ نەکرد و تیا چوو.

---

(١) سورەتی القیامة: ٢.

(٢) سورەتی الاعراف: ٢٣.

(٣) سورەتی البقرة: ٣٧.

موسى (عليه السلام) كاتێك بەناهەق كەسێك دەكوژێ، ڕەخنەی زاتی لەخۆی دەگرێ، قورئان بۆ ئێمەی تۆمار دەكات: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾[١].

يونس (عليه السلام) توڕە دەبێ، دواتر ڕەخنەی زاتی لەخۆی دەگرێ دەفەرموێت: ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[٢].

هەروەها خاوەنی بيستانەكە دوای هەڵە كردنيان لە بۆچون و كردارەكەيان گوتيان: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾﴾. ڕەخنەی زاتی بوو، دوايی پياوی عاقڵ و ژيريان تێدا بوو، ڕەخنەی زاتی گرت و هۆكاری دەرەكی نەبو، بۆيە هەنگاوی هەستانەوە و چارەسەری نا، فەرموی: ﴿قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾﴾[٣]. ئينجا سەركەوتو بون.

ئاوڕێك لەمێژووی گەورە دەسەڵاتدارو پياوانی حوكمداری ڕەشيد بدەينەوە، كە پێك دين لە چوار وەزيرو خەليفەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها بەشێك لە دەسەڵاتدارانی (١٣) سەدەی دوای ئەوان، بۆت دەردەكەوێ كە ڕەخنەو ڕاست كردنەوە، لاری كاروباری موسڵمانان و هەڵەی پارتە ئيسلامييەكان لە دەسەڵاتی تاكەكانی نێو كومەڵگايە (الأمة).

## لەدوو ڕووەوە تاكەكان بۆيان هەيە ڕەخنە بگرن و هەڵەكانيان ڕاست بكەنەوە:

يەكەم: بەشێك لەتاكەكان كە (الأمة) يان لێ پێك دێت، لەسەريان واجبە چاودێری كاری بەرپرسانی دەسەڵات و حكومەت بكەن، قياسات لەسەر ئەم پێوەرە دەكرێ ڕەخنە لە بەرپرسان و ئەدای پارتی ئيسلامی بگيرێ، لە چوارچێوەی فەرمان بەچاكەو

---

(١) سورەتی القصص: ١٦.

(٢) سورةتی الانبياء: ٨٧.

(٣) سورةتی القلم: ٢٦ - ٢٩.

نەهی لە خراپە. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾(١).

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆی ڕونکردینەتەوە بێ دەنگی و وازهێنان لە ڕاستکردنەوەی هەڵە لە کاری ئیسلامی سەر دەکێشێ بۆ فەسادی و گەندەڵی.

(لتأمرنَّ بالمعروف، ولتنهون عن المنكر، ولتأخذنَّ على يد السفيه، ولتأطرنه على الحقِّ أطرًا، أو ليضربن الله بقلوب بعضكم على بعضٍ، ثم يلعنكم كما لعنهم)(٢).

دووەم: تاکەکانی کۆمەڵگا (الأمة) سەرچاوەی دەسەڵاتی دەسەڵاتدارانن، بەو پێوەرەی ئەوان نوێنەریانن.

کەواتە: لە بنەچەدا دەبی بەرپرسە سیاسیەکان پرس و ڕاو مەشوەرەت لەگەڵ خەڵك و جەماوەر بکەن، لە چوارچێوەی یاسای: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾(٣).

تاکو تاکەکانی گومەڵگا سەرچاوەی دەسەڵات بن، دەبێ هەڵەکانیان ڕاست بکەنەوە و لارو لەوێری و خوارو خێچی و فەسادیان بۆ نیشان بکەن.

دەسەڵاتی تاکەکانی کومەڵگا (الأمة) بەڵگەو دەلیلی بێ شوماری لەسەرە، جێگای نیقاش و گفتوگۆ نیە. جێنشینەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەکردار لە ژیانی دەسەڵاتی سیاسیان جێ بەجێیان کردوە، ئەوانەی لێیان لاداوە دەسەڵاتداربون، یان لەنێو پارتە ئیسلامیەکانی دونیا ویست و خۆ ویست و بەرژەوەندی خواز بون، یان نەشارەزابون.

---

(١) سورەتی ال عمران: ١٠٤.

(٢) بڕوانە: مشكل الاپار ، ژمارە ، (١١٦٣).

(٣) سورەتی الشوری: ٣٨.

-پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حەوت وەسیەتی بۆ ئەبو زەر کرد: یەکیکیان فەرمووی (وأمرني أن أقول بالحق وإن كان مُرّاً)[١] ، واتە : فەرمانی پێ کردم حەق بڵێم با تاڵیش بێ.

-ئیمامی ئەبو بەکر یەکەم کەس بوو حوکمی گرتە دەست لە دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دانی بە دەسەڵاتی تاکەکانی گومەڵگا دانا، مافی دانێ ئەگەر لەرِێ لای دا راستی بکەنەوە!!! فەرمووی :( أَيُّها الناسُ فَإني قد وُلِّيتُ عليكم ولست بخيركم فإنْ أَحْسَنْتُ فَأَعِينُوني وإِنْ أَسَأْتُ فَقَوِّمُوني.)[٢]. واتە: ئەی خەڵکینە من کاروباری ئێوەم گرتۆتە دەست، مەرج نیە لەئێوە باشتر بم، ئەگەر کاری باشم کرد پالپشتیم بکەن، وەئەگەر کاری خراپم کرد راستم بکەنەوە. کام سەرکردەی سیاسی ئیسلامی ئەمرِۆ گوێ بۆ کەس دەگرێ، تا دەوروبەرو بیتانەکەی خۆی هەبێ.

-عومەری کوری خەتاب دوای ئەو فەرمووی: (أيها الناس من رأى منكم فيّ اعوجاجاً فليقومه). واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە لاریتان لەمن بینی راستم بکەنەوە.

-هەروەها پیاوێك بەئیمامی عمری گوت : اتق الله يا عمر : لەخودا بترسێ ئەی عومەر، پیاوێك لەو لاوە پێی گوت بێ دەنگ بە زیادە رەویت کرد بەرامبەر گەورەی ئیماندااران، عمر پێ گوت لێی گەرِێ، (لا خير فيهم إن لم يقولوها لنا، ولا خير فينا إن لم نقبل)[٣]. واتە: خێر لەکەسانێدا نییە راستیمان پێ نەلێَ، خێر لەئێمەش دا نییە قبوڵی رەخنە نەکەین.

-موعاویەی کورِی ئەبو سوفیان عەتای بەند کردبوو، نەی دەهێشت لەگەڵ خەڵگ تێکەل ببێ، ئەبو موسلیمی خولانی بە موعاوییەی گوت: ( يامعاوية؛ إنه ليس من كدِّك، ولا من كدِّ أبيك، ولا من كدِّ أمك. قال: فغضب معاوية ونزل عن المنبر، وقال لهم: مَكانكم. وغاب عن أعينهم ساعةً، ثم خرج عليهم وقد اغتسل، فقال: إن أبا مسلم

---

(١) بڕوانە مسندی ئیمام احمد ژمارە (٢١٤١٥).

(٢) بڕوانە: سيرة ابن هشام : ج٤/لا٢٤٠، عيون الأخبار لابن قتيبة : ج٢/ لا٢٣٤.

(٣) بڕوانە: کیتابی الخراج ی ابو یوسف ، (لا١٢).

كلَّمني بكلامٍ أغضبَني ... وإني دخلتُ فاغتسلتُ، وصدق أبو مسلم: أنه ليس من كدِّي، ولا منَ كدِّ أبي، فهَلمُّوا إلى عطائكم)[١]. واته: ئەی موعاویە ئەمە بەرهەمی ماندوبونی تۆ نییە، وەنە بەرهەمی ماندوبونی باوکتە، وەنە بەرهەمی ماندوبونی دایکتە، گوتی موعاویە تۆڕە بوو لەسەر مینبەر دابەزی، پێی گوتن: دوای بزر بوو لەبەر چاویان، دوایی هاتەوە لایان و دەرکەوتەوە خۆی شۆردبو، گوتی باوکی موسلیم چەند وتەیەکی فەرمو تورەی کردم، دوایی چومە ژورەوەو خۆم شۆرد، بەڕاستی باوکی موسلیم ڕاستی کرد، بەڕاستی ئەمە بەرهەمی ماندوبونی من نییە و بەرهەمی ماندوبونی باوکیشم نییە، بڕۆن بەرەو لای عەتا.

-ئیبنوالقیم: فەرمودەیەك دەهێنێتەوە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: لە عیبادەی کوڕی صامت: بەیعەتمان دا پێغەمبەری خودا لەسەر: (على أن نقول بالحقِّ حيث كنَّا، ولا نَخاف في الله لومةَ لائم).[٢]. عوبادەی کوڕی سامت دەفەرموێت: بەیعەتمان دا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ڕاستی و حەق بڵێین لە هەر شوێنێك بین، لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسین.

ئەمانە گشتیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە تاکەکانی گومەڵگا (الأمه) دەسەڵاتیان بەسەر بەرپرسە حکومیەکان هەیە، کە پێك هاتون لە خەلیفە و ئەمیر و گەورە بەرپرسان، قیاسات لەسەر ئەم پێوەرە بەرپرسانی حیزبە ئیسلامیەکانیش، مادام ناویان لەخۆ ناوە پڕۆژەی ئیسلامی، وەهەڵدەستن بەم کارە و خۆیان بەنوێنەری خەڵك دەزانن، ئەگەر لار و لەوێر بن زیاتر دەیانگرێتەوە.

---

(١) بڕوانە: مقامات العلماء بين يدى الخلفا و والأمرا و صـ ٣٠٠ أثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الأموية صـ ٣٠٧.

(٢) بڕوانە: صحیحی موسلیم، ژمارە(١٧٠٩).

## ئامانجی ئەم نوسراوە

هەرچەندە ڕەخنە گرتن توزێك قورسە لەسەر دڵی مرۆڤەکان، بەڵام واجبی شەرعی و دینی خودا لەپێش ڕاگرتنی دڵی خەڵك و ڕەزامەندی مرۆڤەکانە، بێگومان ئامانج لە نوسینی ئەم نوسراوە ڕەخنە ئامێزە جێبەجێ کردنی حوکمێکی شەرعییە، چونکە بەندە ئەم کارە لە چوارچێوەی بەرپرسیاریەتی شەرعی و واجب دەزانم، هەروەها جێبەجێ کردنی فەرمودەیەکی شیرینی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (الدِّينُ النَّصِيحَةُ قُلْنَا : لِمَنْ ؟ قَالَ : لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ)[١]. حیزبە ئیسلامییەکانیش وەك جێگرەوەی ئیمامەتی موسڵمانان و سیاسەتکردن و ئیدارەدانی کاری بانگخوازی دادەنرێن، نوسەرو بیرمەندیش کاری سەرەکی پێشنیارو پڕۆژە و ڕەخنە گرتن و تیشك خستنە سەر خاڵە لاوازەکانە، وەك سەرەتایەك بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، هەروەها بەرەوپێش بردنی پڕۆژە و کاری ئیسلامی و گەیشتن بە لوتکەی دەسەڵات.

### زەمەن و پانتایی پاشەکشە و خاڵە لاوەزەکان لە ڕووی مێژووییەوە

چارەکە سەدەیەك زیاترە ڕابوونی ئیسلامی لەڕێگەی حیزبی سیاسیەوە لەکوردستان کار دەکات، هەرچەندە خاڵە لاوەزەکان زۆربەیان بەدرێژایی قۆناغەکان زۆر لێك نزیك و زۆر جاریش هەمان خاڵن، بەڵام دەکرێ کۆمەڵێك جیاوازیان هەبێ لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێك، یان لە حیزبێکە وە بۆ حیزبێکی تر، خاڵە جەوهەری و بنەڕەتییەکان هەر یەکن و جیاوازیان نییە، لێرەوە ئێمە زەمەن و شوێن و ساڵی حیزبێکی تایبەتی ئیسلامی دیاری ناکەین، لە دیاری کردنی خاڵەکان، ناوی کەس و حیزب و ڕەوتێکی سیاسی ناهێنین، بۆ ئەوەی بۆ هەموو کاتێك گونجاو بێت، لەسەر

---

(١) بڕوانە: ئیمامی موسلیم، بەژمارە (٥٥).

لایەنێك نەشكێتەوە، مەیلی كەسی تێدا نەبێ، لە چوارچێوەی بەدواداچون، لەگەڵ بون، دیراسە و، مەقالە نوسین، سەرنج و تێبینی، حیوار و نیقاشی چەندان ساڵە، پاشەكشەی پڕۆژەكە بەگشتی، ئەم خاڵانە دیاری دەكەین، وەك دیراسەیەكی مەیدانی و عەمەلی لە پڕۆژە و كاری سیاسی ئیسلامی، پەنجە دەخەینە سەر ئەو برینانەی بونەتە هۆكاری سەرەكی پاشەكشە، یان بەلای كەم ڕاوەستان و بەستەڵكبونی پڕۆژە و كاری ئیسلامی، خۆ ئەگەر لە هەندێكیان بەندە بەهەڵە داچو بوو، دەكرێ بۆ گەشە سەندن و پێشكەوتن و هەنگاوی سەركەوتن سودیان لێ ببینین.

## واقیعی ئێستای جیهان لەڕووی فکریەوە

ڕەوڕەوەی پڕۆژەی سیاسی ئیسلامی بەشێکی پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە لەگەڵ ڕەوتە فکرییەکانی سەردەم، لەگەڵ بونی ململانییەکی بەهێز، بۆیە پێویست دەکا بەکورتی ئاماژەیەك بەم واقیعەی ئێستا بدەین، ئایا ئێستا جیهان لە ڕووی فکریەوە کێ بەڕێوەی دەبات؟. دیارە جیهان بەگشتی لەسەر دو خاڵ یەکدەنگن:

**یەکەم:** ڕێککەوتوە لەسەر یەك فکرەی سەرمایەداری.

**دووەم:** ململانێیەکی بەهێز لەنێوان سەرجەم وڵاتە زەبەلاح و بەهێزەکاندا.

فکری سەرمایەداری هەیمەنەی کردوەو خۆی سەپاندوە بەسەر هەمو جیهاندا، گەورەترین دەوڵەتی وەك ئەمریکا، چین، ڕوسیا سەرمایەدارییین، ڕاستە چین بیرۆکەی شوعیەتی هەڵگرتوە، بەڵام لەواقیعدا گەورەترین وڵاتی سەرمایەداریە، کەواتە جیهان فکرە و سیستەمی سەرمایەداری بەڕێوەی دەبات.

لە لایەکی ترەوە ململانێیەکی (الصراع) قووڵ لە ڕووی ئابوری و سیاسی و سەربازی و خۆسەپاندن و غەزوی فیکری لە نێوانیاندا هەیە، بۆیە (فوکو یاما) ناوی ناوە کوتایی مێژوو (نهایە التاریخ)، ململانێکە لەنێوان سەرجەم وڵاتەکان ئەوەندە قوڵە بۆیە پێیان وایە دەگەینە کۆتایی مێژوو. ئەم دوو هۆکار و ئاراستەیە بەتایبەتی لەدوای شۆڕشی فەرەنسی پێیان وایە ئایین گەورەترین بەربەستە لەپێش پێشکەوتن و جوڵەی زانستی، بۆیە دەبێ دین بەهەمو شێوەیەك لە ژیان دوور بخرێتەوە، ئەمانە بونەتە هۆکارێکی سەرەکی کە تەواوی جیهانی ڕۆژئاوا دژایەتی حیزبە ئیسلامییەکان و پڕۆژە و ڕابوونی ئیسلامی بکەن بەم شێوەیەی کەهەیە.

لەم نێوەندەدا ئەوەی دەیەوێت خەڵك ئاڕاستە بکات بۆ ئاڕاستەی ژیانێکی ژیرانە و تەندروست، زەوی بەئاسمان ببەستێتەوە، مرۆڤەکان بۆ وەحی خودایی بگێڕتەوە،

ئەمە ئەم ڕابوونە ئیسلامییە جوان و پاکەیە. لەتەواوی بوارەکانی فکرو سیاسەت و ئابوری و کومەڵایەتی و پێکەوە ژیان و ڕێزو بەهای مرۆڤایەتی، هەروەها لەڕووی زانست و زانیاری و پەروەردە و فێرکردن و بەرز کردنەوەی ئاستی ژیری مرۆڤەکان. ماددەگەرایی دونیای تەنیوەتەوە، هیچ متمانە لەنێوان تاك و کۆمەڵگا، تەنانەت حیزب و دەوڵەتەکانیش نەماوە، مرۆڤ بون و بەها باڵاکانی مرۆڤایەتی لە جیهانی ماددەگەرایی زۆر لاواز بوینە، بەرەو نەمان دەچن، ململانێ بە ئەندازەیەك چۆتە پێش تا ڕەشکردنەوەی یەکتر، مرۆڤ بۆتە قوربانی هەموو شتێك، بۆیە کاری حیزبە ئیسلامیەکان و تاکی موسڵمان زۆر پێویست ترو قورستر بوە.

## سەرەقەڵەمێك لە بارەی ستراتیجی سیاسی

دارِشتنی ستراتیجیەتی سیاسی لە جیهانی عەولەمە و ململانێی سیاسی و شارستانیەت و فکر، تێرامان و وردبونەوەی زۆری پێویستە، چونکە ستراتیجیەتی سیاسی واتە تێگەیشتن و دارِشتنی نەخشەی سیاسی بۆ گەیشتن و ململانێ لەسەر دەسەڵات، وەك قول هانس مورغنتاو دەڵێت: (السياسة: صراع من أجل القوة والسيطرة)[١]، واتە: سیاسەت ململانێیە لەپێناو هێزو زاڵ بونی دەسەڵات. هەروەها سیاسەت بە پێی پێناسەی مەوسوعەی زانستە سیاسیەکان بریتییە لە: (فن إدارة المجتمعات الانسانية)[٢]. واتە: هونەری بەرِێوەبردنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، یان وەك یاساییەکان دەڵێن: (أصول أو فن إدارة الشؤون العامة)[٣]. واتە: بنەما و هونەری ئیدارەدانی کاروباری گشتییە، یان وەك ابن نجيم دەفەرموێت: (السياسة: هي فعل شيء من الحاكم لمصلحة يراها وإن لم يرد بذلك الفعل دليل جزئي)[٤]. واتە: سیاسەت کردەوەکانی سەرۆکێکی وڵاتە، دەیکات بۆ بەرژەوەندی گەل، با ئەم کردەوەیە بەڵگەی جوزئی لەسەر نەبێ. فتحی یکن: دەڵێت: (إن السياسة تعنى فى مفهومنا الاسلامي رعاية شؤون الأمة، وبهذا يكون للسياسة مفهوم رعائى يشمل كل نواحى الحياة، ويتصل بكل جانب من جوانبها المختلفة)[٥]. واتە: سیاسەتکردن بەتێگەیشتنی ئیسلامی واتە چاودێری و سەرپەرشتی کاروباری ئەمەت، بەم پێوەرە سیاسەتکردن چاودێری تەواوی بەش و لایەنە جیاوازەکانی ژیان دەکات.

---

(١) برِوانە : السياسه بين الأمم ، هانس مورغنتاو، لا ١٣.

(٢) برِوانە: موسوعه العلوم السياسه، زانکوی کويت، لا ١٠٢، برگە(٧٨).

(٣) برِوانە: موسوعه العلوم السياسه، زانکوی کويت، لا ١٠٢، برگە(٧٨).

(٤) برِوانە: البحر الرائق، ئيبن نجيم، (٥ /١١).

(٥) برِوانە: أضواء على التجربه النيابيه الاسلاميه فى لبنان، فتحى يكن، لا ١٩.

لەگەڵ ئەوەی وشەی سیاسەت لەقورئاندا نەهاتوە، بەڵام ئەم چەمك و زاراوانەی پەیوەندیان بەسیاسەت و ئیدارە و هونەری بەڕێوەبردن هەیە وەك: (ملك، شوری، حوكم، تمكین، استخلاف)، هەروەها بەسەرهاتی زاڵم و مەزڵوم، حاكم و مەحكوم، دەسەڵات و خەڵك، بەدورو درێژی هاتوە، تابتوانی لە چوارچێوەی ئەم یاسا گشتیانە سیاسەت بكەی و كاروباری كۆمەڵگا بەڕێوە ببەی. پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، بەڕاشكاوانە باسی ئیدارە و سیاسەت و بەڕێوەبردنی میللەتانی كردوە لە لایەن پێغەمبەرانەوە، سەلامی خودایان لەسەر، دەفەرموێت: (كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ، كُلَّمَا هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ، وإِنَّه لا نَبِيَّ بَعْدِي، وَسَتَكُونُ خُلَفَاءُ فَتَكْثُرُ، قالوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قالَ: فُوا بِبَيْعَةِ الأَوَّلِ، فَالأَوَّلِ، وَأَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فإِنَّ اللَّهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ)[1].

سیاسەت و هونەری بەڕێوەبردن ئاڵۆزترین كاری سەردەمەكانە، سەرەتا پێغەمبەران سەلامی خودایان لەسەر پێی هەڵساون، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پیرۆزی كاری سیاسی و ئیدارەدانی خەڵك، دواتر جێنشین و جێگرەوەكانیان بەم كارە پیرۆزە هەڵساون، بەڵام لە درێژەی ڕەوڕەوەی ژیان، گۆڕانكاری بەسەر شێوازی ئیدارەدان و خەڵك هاتوە، زۆرترین گرفت و كێشە و شەڕو ململانێی لێكەوتۆتەوە، بۆیە كاری سیاسی پێویستی بەسەركردە و سیاسەتمەدار و وشیاریەكی بێ ئەندازە هەیە، چونكە ڕێكخستنی نێوان دەسەڵات و میللەتە. بەڵام ڕێك خستنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا، واتە خوداپەرستی كەسی، دەق و بنەمای شەرعی زۆری لەبارەوە هاتوەو نەگۆڕن، لەڕووی بنەماكانی ئیمان و بەهێزكردنی تادەگاتە ئەخلاق و سلوك و تەدەیون، قورئان و سونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، یاسای شەرعی و ئسولی فیقهی، نوسراوە فیقهیەكان، تەفسیرەكانی قورئانی پیرۆز، شەرحی فەرمودەكانی پێغەمبەرو سیرەی ٢٣ساڵی ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) پانتاییەكی زۆریان بۆ بنەمای ئیمانی و سلوكی تاك پڕكردۆتەوە. بابەتی خواپەرستی كەسی نێوان تاك و خودا زۆربەی دەقەكانی نەگۆڕن، كەمێك جیاوازی هەیە لە

---

(١) بڕوانە: صحیحی بوخاری، ژمارە (٣٤٥٥)، ومسلم ، بەژمارە، ( ١٨٤٢).

بابەتە فیقهیەکان، بۆیە ئەم تەوەرە ئاڵۆز نیە وەك سیاسەتکردن، شەریعەتی ئیسلامی زاراوەی ئیجتیهادی فقهی بەکارهێناوە بۆ نێوەندکردن و پراکتیکەکردنی دەقەکانی قورئان و سونەتی سەحیحی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ واقیع، ئاوڕ لە مێژووی تەشریعی ئیسلامی بدەینەوە سەروەتێکی بێ ژمارمان هەیە لە ئیجتیهادی فیقهی، لەبابەتی سلوك و ئەخلاق و باری کەسی، بۆ هەموو سەردەم و زەمان و مەکان و پێشکەوتن و شارستانیەت و ئاوەدانکردنەوەی گەلان دەگونجێ، نەگۆڕن و گۆڕانی بەسەر داناییت، وەك نوێژ، رۆژو، زەکات، حەج، ئەحکامەکانی، بابەتە خودا پەرستی و سلوکیەکانی، هەروەها بابەتی مارەبڕین و میرات و تەڵاق و ..هتد، ئەمانە گوازراوەتەوە بۆ ناو کۆمەڵگا لەڕێی مینبەرو مەنهەجی خویندنی شەرعی و حوجرە و مزگەوتەکانەوە، بۆیە ئەدەبیاتی زۆربەی حیزبە ئیسلامیەکان کاریگەری ئەم بەشەیان لەسەر بوە، گرنگی زۆریان بەدولایەن داوە، لایەنی خواپەرستی کەسی، واتە نێوان خۆت و خودا، لەگەڵ لایەنی تەنزیمی حیزبی، ئەمانە گرنگن، بەڵام لایەنەکانی: چۆنیەتی هەڵس و کەوتی ئەندامان لەگەڵ واقیع، ڕوداوەکان، دەروبەر، دەوڵەتداری، سیاسەت کردنی سەرکەوتو، زانست و فەلسەفەی سیاسی، دبلۆماسی، یاسای نێودەوڵەتی، حیزبایەتییێکی بەهێز خۆی ببێتە بەدیل، تێکەڵی جەماوەر بەگشتی، خاوەن قەزیە، خاوەن دیدگایەکی دورو درێژ، خیتابێکی شارستانی و بینای ئاوەدانکردنەوە، دروستکردنی دەیان قائید و قیادە، نەخشە ڕێگای ستراتیجی سیاسی، پەیوەندی نێو دەوڵەتی، دەزگای هەواڵ و زانیاری، هتد. گرنگی بەوانە نەداوەو زۆر لاوازە. هۆکاری سەرەکیش ئاوڕدانەوەی تاکەکانە بۆ ناوەخۆی حیزب و ئەدەبیاتی فقهی عیبادەت، ئاراستە تەدەیونەکە زاڵە بەسەر لایەنەکانی تر، هەروەها قەیرانی فکری و ئیختلافاتی فقهی، زۆرترین پانتایی لەژیانی تاکەکان گرتوە، جگە لەخۆ خەریککردنی زۆر لەگەڵ دەقە فیقهیە زەنیەکان. واتە ئاراستەکە ڕوو لەناوخۆیە زیاتر لەوەی ڕوی لەدەرەوەو واقیعەکە بێت.

بابەتی بەرپرسیارییەتی گشتی، یان ئیجتیهادی سیاسی دەچێتە نێو بازنەی (فرض الکفایة)، هەروەها دەقەکانی قورئان و سونەتی سەحیحی پێغەمبەر (صلی

الله علیه وسلم) بە شێوازی یاسا گشتیەکان (القواعد الکلیه) باس کراوە، پێویستی بە فەهم و تێگەیشتنی ورد و جیاوازی زەمان و مەکان و تواناوە هەیە، لەگەڵ بەرەو پێش چون و گەشەسەندنی کۆمەڵگا، ڕووبەڕووبونەوەیەکی تازە پەیدا بوو، پێویستی بەڕێکخستنەوەی نوێ هەبوو، پڕ بوو لەگرفت و کێشە، بابەتی تازەو نوێ، جیاواز لە بابەتەکانی ئیهانی و سلوکی و ئەخلاقی و باری کەسی سەریان هەڵدا، لەگەڵ گەشە سەندنی ستراتیجیەتی سیاسی، ئیجتیهادی فقهی بەشێوازیکی تر دەرگای کردەوە بەڕووی بابەتی تازە.

لەنێو کتێبە فقهیەکان ناوەرۆکی کاری سیاسی وەك : (الإمامة، القضاء، الحدود، الجهاد)، هاتوە، دواتر لەکتێبی تایبەت وەك کتێبی خەراج لە لایەن یحی بن ئادەم و قازی یوسف بۆ دەوڵەتداری سەردەمی هارون الرشید نوسراوەتەوە، ڕێکاری ئیدارەدانی سیاسەت و ئیدارە بوو، نوسینەوەی سیرەی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لەلایەن محمد بن حسن الشیبانی بۆ سوپا و یاساکانی جەنگ، کتێبی (الاحکام السلطانیة) بۆ ڕێکخستنی کاروباری سیاسی و ئیداری و ئیجتیهادی سیاسی نوسرایەوە، لەلایەن قازی ماوەردی شافعی و ئەبو ئەعلای حەنبلی. کتێبی (غیاث الامم في التیاث الظلم) ئیهامی جوینی و، (طرق الحکمیة) ئیبن القیم جوزی، باسی هۆنەری سیاسەت و بەڕێوەبردنە.

دوای ئەوەی ئیدارەدانی دەوڵەت و دەسەڵات وسیاسەت گۆڕانکاری بەسەر داهات، پسپۆرییەکان زۆر وردتر بونەوە، دونیا بەرەو پسپۆری زۆر تایبەت چوو، پێویستە لێرە ئیجتیهادی فقهی لە ئیجتیهادی سیاسی جیابکەینەوە، مەبەستم پسپۆڕی وردە (ئەگەر نا سیاسەت فەرعێکە لە فیقە) وەك گوتراوە (أن الفقه هو علم الفروع). ئیجتیهادی فقهی بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارە تازە و سەردەمیەکانە لە بواری پەیوەندی تاك بەخواپەرستییەوە، بەتێگەیشتن و هەڵێنجاندنی حوکم و بڕیار لەو دەقانەی لەبەر دەستدایە، بەبەستانەوەیان لەگەڵ واقیع، ئەم ئیجتیهادە فراوانی و زیندوی و هێز دەداتە واقیعە نوێیەکە، ئەوەی پێویستە لێرە بگوترێ ئەو کەسەی ئەم ئیجتیهادە دەکات پێویستە فەقیە و قازی و زانا بێت، بەڵام ئیجتیهادی سیاسی

بابەتەکانی لەچوارچێوەی ئیدارەدانی سیاسەت و حیزبایەتی و دەوڵەتداری و هونەری بەڕێوەبردنن. ئەو کەسەی بە ئیجتیهادی سیاسی هەڵدەستی مەرج نیە فەقیە و زاناو قازی بێت، بەڵکو پسپۆر بێت لە زانستی سیاسی و فەلسەفە و مومارەسەی سیاسی، کەواتە گەیشتینە دەرئەنجام، ئیجتیهادی فقهی جیاوازە لەگەڵ ئیجتیهادی سیاسی. بۆ ئەوەی بیرۆکەی جیاوازیەکە نزیك کەینەوە، ئیجتیهادی سیاسی و ئیداری، کە جاران فکری سیاسی بۆ بەکار هاتوە، بریتییە لەم ڕا جیایی و بڕیارانەی بۆ کاری سیاسی دەدرێت، وەك ابن خلدون ناوی ناوە (العمران)، لەچوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامی، (السیاسة الشرعیة) ئەم دو زاراوەیە جیاوازن لەپیناسە کردندا، شەریعەت: واتە: (وضع إلهی ثابت) شەریعەت خودا دایناوە و ناگۆڕێ، سیاسەت بە مانا گشتیەکەی بەبێ ئیزافە، واتە (التدابیر) هونەری بەڕێوەبردن، بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگا و دەوڵەت بەتەجروبە و عەقڵ، بەڵام لە دیدگای ئیسلامی واتە: بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا و حکومەت بەپێی مەقاصیدی شەرعی، نەك بەتەنها عەقڵ، بەم پێوەرە ئیجتهادی سیاسی ئیسلامی (السیاسة الشرعیة) جیا دەکرێتەوە لەگەڵ ئیجتیهادی سیاسی عەلمانی و فکرە دەستکردەکان.

چەند نمونەیەکمان پێویستە بۆ ئیجتیهادی سیاسی، بۆ نمونە حیزبی ئیسلامی ڕا جیاییان هەیە لە بەشداری هەڵبژاردنەکان و چونە پەرلەمان، یان هاوپەیمانی لەگەڵ عەلمانیەکان، بەشێکیان پشتگیری و تەئیدی دەکەن، بەشەکەی تر زیادەڕەوی تێدا دەکەن و بەدەرچون لە ئیمان و عەقیدەی دەزانن، دەڵێن بەشداری کردن هاوبەش دانانە، چونکە پەرلەمان شوێنی دانانی تەشریعە، تەشریعیش تەنها بۆ خودایە، هەروەها ڕا جیایان هەیە لەبارەی ئاریشەکانی ئافرەت و خۆ هەڵبژاردنی، یان هەڵبژاردنی تاکێکی مەسیحی، یان هەر ئاینێکی تر لەسەر لیستی ئیسلامییەکان، ئەم بابەتانە دەچنە چوارچێوەی ئیجتهادی سیاسی. هەموو ئەوانە بابەتی تێڕامان و ورد بونەوە و ئیجتیهاد تێداکردنە، هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ ئەم واقیعانەی ئێستا، کە جیهان بۆتە عەلمانیەت و سیستەمی سەرمایەداری، ناکرێ بەپێوەرێکی نەگۆڕ هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکەی، بەڵکو پێویستیان بە پێوەری مەسالح و مەفاسید هەیە لەچوارچێوەی

سیاسەی شەرعی، ئیجتیهادی سیاسی پێویستی بەتێڕامان و بیرکردنەوە هەیە، نابی بڕیاری ئیجتیهادی سیاسی بەموقەدەس تەماشا بکەیت، هەر لە درێژەی کاروانی ڕابوونی ئیسلامی ئیجتیهاد کراوە لە بارەی بەشداری لە پەرلەمان، بەحەڕام و کوفر لەقەڵەم دراوە، دواتر ئیجتیهادەکە گۆڕدراوە کەبەشداری کردن لەپەرلەمان دروستە و گرفتی نییە، ئەگەر بڕیارەکە لە چوارچێوەی تەقدیس کردن تەماشا بکەین، زۆر گرفتمان بۆ دروست دەبێ لەکاری سیاسی، ئەمە نمونەیەکی زیندوە بۆ هەموو ئەم ستراتیجیە سیاسیەی کەلێرەدا ئاماژەم پێ کردوە.

بزوتنەوە ئیسلامییەکان ئەمڕۆ پێوستیان بەداڕشتنی فکری ئیجتهادی سیاسی ستراتیجی نوێ هەیە، پێویستیان بەفقهی ژیان هەیە، فقهی پەیوەندی مرۆڤەکان بەخۆی و خانەوادەکەی، کۆمەڵگاکەی، دەوڵەتی، نیشتیمانی، میللەتی، ئومەی ئیسلامی، جیهانی دەرەوەی خۆی، بە تێگەیشتنی قوڵ، ڕاستکردنەوەی چەمکەکان، گەشەسەندنی ئامڕازو ئالیات، هەروەها بەستنەوەی بەواقیع، کە ئیلهام وەرگری لەیاساکانی سیاسەی شەرعی و تێڕوانینی واقیع و جۆر و شێواز و گرفتەکانی. یەکێك لەگرفتە گەورەکان و هۆکاری پاشەکشەی حیزبی ئیسلامی و ڕابوونەکەی بەموقەدەس کردنی بڕیارەکانی ئیجتیهادی سیاسیە، ئیجتیهادێکی سیاسی کەسەکان بۆ چارەسەری گرفتەکانی سەردەم موقەدەس نیە، بەڵکو جۆرێکە لە بیرکردنەوە و هەڵێنجاندنی بڕیاری سیاسی مرۆڤەکان، بەرامبەرەکانیش بۆیان هەیە هەمان هەڵێنجاندن بکەن بە بۆچونێکی جیاواز. بەم پێوەرە ئیجتیهادی سیاسی حیزبی ئیسلامی ڕزگار دەکات لەبەرتەسکی لە تاکە بۆچونێك، بۆ فرە بۆچونی جیاواز، هەروەها لەبەر تەسك کردنەوە و حوکم دان بەسەر بەرامبەرەکان، وەك کافرکردن و بیدعە و زەلالەت، بۆ برایەتی و لێك تێگەیشتن و مرۆڤایەتی و سیاسەتکردنێکی واقعی و سەرکەوتو، ئاسۆیەکی فراوان لە ستراتیجیەتی سیاسی[١].

---

(١) بڕوانە: الحركة الاسلامية من المواجهه الى المراجعه، كمال السعيد حبيب ، لا ١٠٩.

## بنەماکانی ستراتیجیەتی سیاسی

ستراتیجیەت واتە: دیاری کردنی ئامانج و ئاراستەی سەرەکی حیزب و ڕەوت و بزوتنەوە گۆڕانخوازەکان، بۆ گۆڕانکاری ڕیشەیی لەکۆمەڵگا، ئەم شێوازەش بە پێی قۆناغە مێژوویەکان دەگۆڕێت.

دیارە هەر حوکم و مەدرەسەو ئایدیا و ئایدیۆلۆژیایەك شێواز و ئالیەتی ستراتیجیەتی سیاسی جیاوازە لەوی تر، ستراتیجیەتی سیاسی ئیشتراکیەت بۆ گۆڕانکاری لە سیستەمی حوکم و ئیدارەدانی کۆمەڵگا جیاوازە، هەروەها ستراتیجیەتی سیاسی سەرمایەداری تێڕوانینی بۆ گۆڕانکاری جیاوازە لەئایدۆلۆژیاکانی تر، بێگومان ستراتیجیەتی سیاسی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی زۆر جیاوازە بۆ گۆڕانکاری لە سیستەمی حوکم و دەسەڵات و ئیدارەی کۆمەڵگا، مەبەست تێدا تەنها ڕەزامەندی خودایە، بۆ ئەم مەبەستە، هەمو هەنگاوێکی کاری سیاسی پێویستمان بە بنەماکانی ستراتیجیەتی سیاسی هەیە تابەرچاو ڕون بین، بەشێك لە هۆکاری پاشەکشەی کاری سیاسی نەبونی شارەزاییە لەستراتیجیەتی سیاسی، چەند گوڵبژێرێك لە بنەماکانی ستراتیجیەتی سیاسی باس دەکەین:

### یەکەم: ستراتیجیەتی سیاسی ئیسلامی مەقاسیدە بەرزەکانی شکۆی مرۆڤی تێدا پارێزراوە.

مرۆڤ بەرزترین دروستکراوە لەبونەوەر، بۆیە ستراتیجیەتی سیاسی پاراستنی شکۆیەتی، هەموو هەنگاوە سیاسیەکان لە چوارچێوەی خزمەتکردنی مرۆڤ دەسوڕێتەوە. شێخ تاهیر بن عاشور دەڵێت: ( المقصد الأعلى هو حفظ الأمة واستدامة صلاحه بصلاح المهمين عليه، وهو نوع الانسان ويشمل صلاحه صلاح عقله وصلاح

عمله ومابين يديه من موجودات العالم الذى يعيش فيه)[١]. مەبەستی سەرەکی لە ستراتیجیەتی سیاسی پاراستنی سیستەمی ئومەت و بەردەوام بونییەتی لە چاکسازی ئەوانەی دەسەڵاتیان لەسەری هەیە و بەڕێوەی دەبەن، ئەویش جۆری مرۆڤەکانە، ئەمەشیان شمولی چاکسازی عەقڵ و کرداری دەکات، هەروەها چاکسازی لەوانەی لەبەر دەستیەتی لەم جیهانەی تێیدا دەژی.

دووەم: ستراتیجیەتی چاکسازی و ئیسلاحێکی گشتگیر.

کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەردەوام پێویستی بە چاکسازی هەیە لەڕەوڕەوەی ژیانی، کاتێك مرۆڤەکان لە پەیامی وەحی دورکەوتونەتەوە و لایانداوە، پێویستی بەهاتنی پێغەمبەرێك هەبوە تاستراتیجیەتی سەرەکی چاکسازی و ئیسلاحێکی گشتگیر بی، ﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُ﴾[٢]. ئەو چاکسازیەی پێغەمبەران کردویانە پەرەیان پێ داوەو تەواویان کردوە، هەر چاکسازیەیش لەنێو کۆمەڵگا مابیتەوە بەشداریان تێدا کردوە، بۆیە لەستراتیجیەتی سیاسی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەشداری چاکسازی هاوپەیمانی فزول بو[٣].

سێیەم: گۆڕینی سیستەمی نادادپەروەری جیهانی.

لەمێژودا کۆمەڵێك سەرکردە هاتون ستراتیجیەتی سیاسیان گۆڕینی سیستەم بوە، مێژوی جیهانیان گۆڕیوە، وەك: داریوسی فارسی و ئەسکندری مەقدۆنی و یولیوسی قەیسری ڕومانی و جستینانی بیزەنتی. بەڵام مەبەست تێیدا دەسەڵات و تۆڵە و سزاو دەست بەسەرداگرتن و قۆرغکاری و ستەم بوە، بەڵام ستراتیجیەتی سیاسی ئیسلامی گۆڕینی سیستەمی نادادپەروەری سیاسی جیهان بوە، لە پێناو گەیاندنی پەیامی مرۆڤایەتی، نەك دەست بەسەر داگرتنی ماڵ و دەسەڵات، سزادان و تۆڵە و

---

(١) بڕوانە: مقاصد الشريعة الاسلامية لطاهر بن عاشور، لا٢٧٣.

(٢) سورەتی هود: ٨٨.

(٣) بڕوانە: سيرەی ابن هشام بۆ ئەم هاوپەیمانیە. لا١٣٤.

قۆرغکاری. ئەگەر دەرفەتی سزاو تۆڵە و ماڵ و سامانیش رەخسابی مەبەست نەبوە، زۆر هەوڵدرا قورەیش لە مەکانەت و گەورەیی خۆی بمینێ، بەس بەشداری لەم گۆڕانکارییە بکات، بەڵام قبوڵیان نەکرد، هەروەها بۆ بەشداری کردن و مانەوەیان لەپێگەو مەقامی خۆیان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو: (اللهم اهد قوم انهم لایعلمون)[١]. هەروەها : لە فەتحی مەککە فەرموی : (اذْهَبُوا فَأَنْتُمْ الطُّلَقَاءُ)[٢]. بڕۆن ئێوە ئازادن و تۆلەتان لێ ناکرێتەوە.

## چوارەم: پشوو درێژی و ئومێدی داهاتوو.

ستراتیجیەتی سیاسی بۆ گۆڕانکاری پشو درێژی زۆری دەوێ، قورسترین کار گۆڕانکارییە، دەکرێ گۆڕانکاری بۆ نەوەکانی داهاتو کاریگەری هەبی، بۆ ئەوەی نیەتی کوشتن و بڕین و لەناوبردن نەبی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە تایف گەڕاوە بەم حاڵ و ناخۆشی و بریندار کردنە، چونکە مەبەستی گۆڕانکاریە بۆ نەوەی داهاتوش نەك لەناو بردن، کاتێك بڕیاری لەناو چونیان دەدرێت لەئاسمانەوە لەڕێی مەلائیکەتەوە هەواڵەکە دەدەنە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، گەلی تائیف بخەینە نێوان ئەم کێوە و لەناویان ببەین، دەفەرموێت: (بل أرجو أن یخرج الله من أصلابهم من یعبد الله تعالی وحده لا یشرك به شیئًا)[٣].

## پێنجەم: گەشبینی و سەرکەوتن.

سەرکردەی سیاسی گەشبینە بە داهاتوی سیاسی خۆی، بڕوای هەیە سەردەکەوێ، ئەم ستراتیجیەتە گڕوتین دەداتە کاری سیاسی، بڕوا بون بە سەرکەوتن زیاد دەکات، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر لەسەرەتاوە ستراتیجیەتی ڕوون بو، بۆیە

---

(١) بڕوانە: الشفا بتعریف حقوق المصطفی قاضی عیاض لا١٠٥.

(٢) بڕوانە: سیره ابن هشام» (٢/ ٤١٢).

(٣) بڕوانە: صحیح بخاری ژمارە (٢٠٧٠)، وصحیحی مسلم (١٧٩٥)..

لەکاتی هیجرەت بە سوراقەی گوت (كيف بك إذا لبست سواري كسرى وتاجه)[١]. ئەمە گەشبینیە بەسەرکەوتن.

شەشەم: دەستپێشخەری و چونە پێش، (المبادرة والاقدام).

سروشتی کاری سیاسی وایە ڕێگری زۆر دێتە بەردەمی نابی کۆڵ بدات، بەردەوام ڕێگای نوی و دەستپێشخەری پێویستە، تا لە قۆناغێك نەوەستی، ستراتیجیەتی سیاسی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وابو، دوای ئەوەی زانی قورەیش ڕێگری لەگۆڕانکاری دەکەن، بەرەو تائیف ڕۆیشت، لەوێوە هەمان ڕێگری هەبو، ئەم جارە دەستپێشخەری کرد بۆ مەدینە، ئینجا لەوێ دەسەڵاتی سیاسی گرتە دەست و دەوڵەتی ڕاگەیاند.

حەفتەم: بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆ.

هەموو حیزب و ڕەوتێك هێزی سەرەکی لەیەکبون و ناوخۆدایە، هەر لەسەرەتاوە ستراتیجەیەتی بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆ پێویستە بۆ هەموو کارێکی سیاسی، دوبەرەکی نەهێڵێ، لاوازی و خەت خەتۆکی و تەکەتولی ناوخۆی شکست بەهەمو هەوڵێکی سیاسی دەهێنی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یەك لە ستراتیجیە بەهێزەکانی سیاسی ئەوەبو ناوەخۆی بەهێز کرد، نەك تەنها لەگەڵ موسڵمانان، بەڵکو لەگەڵ تەواوی هاوڵاتی و هاونیشتیمانیان، برایەتی لە مەدینە دروست کرد، کاتێك عمری کوڕی خەتاب پێشنیاری کوشتنی عبداللەی کوڕی سەلولی سەرۆکی مونافیقانی بۆ دەکات، پێی دەفەرموێت: (فَقالَ: دَعْهُ، لا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ.)[٢]، بەم کارەی درز و دووبەرەکی نەکەوتە ناو بەرەی داخلی، بۆیە بە بەهێزی مایەوە.

---

(١) بڕوانە: صحيح البخاري كتاب المناقب ـ باب علامات النبوة (٣٤١٩).

(٢) بڕوانە: أخرجه البخاري (٤٩٠٥)، ومسلم (٢٥٨٤).

## هەشتەم: فراوان نەکردنی جەبهەکانی بەرامبەر.

زۆر مەوقیعی سیاسی هەیە چەند دژێك لە بەرامبەرت کۆدەبنەوە، ستراتیجیەتی سیاسی ئەوەیە هەوڵی لێك ترازانیان بدەی، دژایەتی کردنی هەموان بەیەك جار و لەیەك کاتدا، هەر زوو کۆتایی بە پڕۆژەکەت دێت و گۆڕانکاریت پێ ناکرێ، سترتیجیەتی سیاسی بەهێز لە یەك کاتیدا نابی دژایەتی بەرامبەر هەموویان ڕابگەینی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەیەك کاتیدا قەد شەڕی دوو دوژمنی پێکەوە نەدەکرد، هاوپەیمانی لەگەڵ هەندێکیان دەکرد، هودنەی لەگەڵ بەشێکی تر هەبو، بەنمونە لەڕێگەی نوسینەوەی دەستوری مەدینە هودنەی لەگەڵ یەهودییەکانی مەدینە کرد، ئینجا چوە سەر ڕێگای کاروانی بازرگانی قورەیش، بۆ ئەوەی لەدواوە خەنجەری ژەهراوی لێ نەدرێ و جەبهەکە لەخۆی فراوان نەکات.

## نۆیەم: سیاسەتی دولایەنەو مەرین.

کاری سیاسی بەیەك ڕوو شێواز ناکرێ، واتە لەهەمو کات و ساتەکان یەك جۆر هەڵوێست پەیڕەو ناکرێت، هەندێ جار پێویستە زۆر توند هەڵوێست وەرگری (القوة الصلبة)، وەك ئەوەی نەرمی تێدا نییە، هەندێ جاریش ئەوەندە نەرم بیت (القوة الناعمة) وەك ئەوەی توندی تێدا نییە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەردوو شێوازی لە شوێن و مەوقیفە جیاوازەکان تاقی کردۆتەوە، لە ڕووی نەرمی و ئارامیەوە حەسانی کوری سابیت و عبداللەی کوڕی ڕەواحە وتەبیژی فەرمی دەوڵەتی مەدینە بون، ڕای سپاردن ڕای گشتیان لەسەر ڕوداوەکان دروست دەکرد، هەواڵ و هەڵوێست و بابەتە سیاسیەکانیان دەگوازتەوە بۆ ناو خەڵك بەنەرمی و بەبێ شلەژان. هەروەها هەڵسوکەوتی نەرم بو لەگەڵ ئەسیرەکانی قورەیش، گوتاری نەرم لەگەڵ خەڵکی سقیلی ناو مەکە، بەڵام لەولاوە هێزی بەتوندی بەکارهێنا لە غەزوەی بەدر، لە غەزوەی أحد بەهێزی سەربازی بەرگری لە مەدینە کرد.

## دەیەم: خوێندنەوەی ڕووداوە جیاوازەکان بە شێوازی بابەتیانە.

ستراتیجیەتی سیاسی ورد ئەوەیە ڕووداوو بابەتەکانی ناوچەکە و دەوروبەر تێکەڵ نەکەی، بەشێوازێکی زانستی و بابەتیانە بیانخوێنیەوە وەك خۆی، تا لەکات و شوێنی خۆی بڕیاری دروستی لە بارەیەوە بدەی، ستراتیجیەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وابو هەموو دەستەو تاقمەکانی بەوردی دەخوێندەوە، ئینجا بڕیاری لێ دەدان، دوای ئەوەی زانی بەنو قەینوقاع خەریکی سیاسەتی کزی و ساختەن بەرامبەر دەوڵەتی مەدینە، لە مەدینە دەری کردن.

کاتێك بینی بەنو قوریزە خەریکی سیاسەتی پیلان گێڕین بۆ تێکدانی دەوڵەتی مەدینە، لەڕەگەوە هەڵیکێشان. بەڵام دە ساڵ لەگەڵ عبداللەی کوڕی سەلول و مونافیقەکانی ناو مەدینە ئیدارەی کرد نەدەری کردن، نەدووری خستنەوە[١].

## یانزدەم: بوێری لە بڕیاردان:

ستراتیجیەتی سیاسی پێویستی بەبڕیاری بوێرانە هەیە، لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسی، ڕەچاوی بەرژەوەندی گشتی و کارە سیاسیەکە بکات، نەك ڕازی کردنی دڵی ئەم و ئەو، چونکە ئەوەی سەرکردەی سیاسی دەیبینی و دەیخوێنیتەوە جیاوازە لەگەڵ عامەی خەڵك، نمونەمان زۆرە لە ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم). وەلیدی کوڕی موغەیرەی قوڕەیشی سەرکردەی دیاری کافرەکان بوو، زۆر دژی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، باوکی خالیدە، سەرکردەی سەربازی و شێری خودا، خالید موسڵمان دەبی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بڕیارێکی بوێرانە دەدات و دەیکاتە سەرکردەی سوپای ئیسلامی، ناڵێ خەڵك لێمان تورە دەبێ، لەبەر ئەوەی کوڕی باوکێکی کافرە، بەڵکو لەسەر ئەساسی پسپۆری لەبواری سەرباز دایدەنێ. هەروەها ئەبو سوفیان تابۆی کرا دژایەتی ئیسلام و موسڵمانانی کرد، لەکاتی فەتحی مەککە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مەکانەتی بەرزی دایێ و بڕیارێکی ستراتیجی سیاسی گرنگی دا ، فەرموی: (مَنْ دَخَلَ دَارَ أَبِي سُفْيَانَ فَهُوَ آمِنٌ)[٢].

---

(١) بڕوانە: الربیع الاول قرا وە سیاسیە واستراتیجیە فی السیرە النبویە، وچاح خنفر، لا٢٩.

(٢) بڕوانە: سونەنی ابوداود ، ژمارە (٣٠٢١).

دوانزەم: سەرکەوتن و ژێر کەوتن تەنها پەیوەست نییە بەئیمان و عەقیدە.

یەکێك لە خەلەلی ستراتیجیەتی سیاسی ئێستای پڕۆژەی ئیسلامی ئەوەیە سەرکەوتن و ژێرکەوتن تەنها بەئیمان و عەقیدەوە دەبەستنەوە، بیرکردنەوەی ستراتیجی لە میزانی هێز لەناوچەکە و دیراسەکردنی وەك سونەتی جەنگ، هۆکاری سەرەکی سەرکەوتن و ژێرکەوتنە، قورئان ئەم حەقیقەتە ستراتیجیەتەمان بۆ باس دەکات، موازەنەی هێزمان بۆ دیاری دەکات لەنێوان دوو ئیمپراتۆریەتی جیهانی ، فارس و ڕۆم. دەفەرمویێت: ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥﴾[1].

کورتی کەینەوە ، لێرەدا دوو ئیمپراتۆر حوکم دەکەن لەجیهان، چونەتە نێو جەنگێك کۆتایی هات بە سەرکەوتنی فارس بەسەر ڕۆم، دوای جەنگێکی تر دوای دە ساڵ بەرپا دەبێت کۆتای دێت بەسەرکەوتنی ڕۆم بەسەر فارس، ئەم دو شکستە دەرفەت دەڕەخسێنی بۆ هێزێکی نوێ بێتە مەیدان، هاوکێشەی ئەم دوو هێزە جیهانییە لەبەر چاوی پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم) ئینجا سوپای نارد، بۆ غەزوەی مۆتە ئەگەر ئەم شکستە سەربازییە نەبوایە، بەم هێزە کەمەوە دەبوە جەنگی نابەرامبەر، موسڵمانان نەیان دەتوانی بەم هێزەوە بچنە مەیدانی جەنگ لەگەڵ ڕۆم، ڕۆمیش ئەوەندە بەئاسانی پاشەکشەی نەدەکرد و گۆڕەپانەکەی چۆڵ نەدەکرد[2].

ئەمانە هەمووی ستراتیجیەتی سیاسی وردن، بۆ حیزبی سیاسی گرنگە ئەم بنەمایانە بە وردی پەیڕەو بکات. لەچوارچێوەی ئیجتیهادی سیاسی.

---

(١) سورەتی الروم: ١ – ٥.

(٢) بڕوانە: لماذا يفشل الإسلاميون سياسياً، ياسر الزعاترە، ٥١.

شێوازی دابەشکردنی ئاڵنگاری و گرفت و خاڵە لاوازەکان و چارەسەریان.

**شێوازی ڕەخنەو خاڵی لاوازمان کردۆتە سێ بەشی سەرەکی و دەرئەنجام و چارەسەر بەم شێوازەی خوارەوە:**

**بەشی یەکەم:** ئاڵنگاری و گرفتە سەرەکیەکان کە لەتوانای ئێمە دانین، لەگەڵ ڕێگا چارەسەر.

**بەشی دووەم:** گرفت و خاڵە لاوازەکان لە چوارچێوەی مەنزومەی گشتی، وەك قیادە، ئیدارە، فکر، تواناو مهارات، ئیدارەی ململانی.

**بەشی سێەم:** گرفت و خاڵە لاوازە ناوخۆییەکان بەشێوازێکی ورد و هەمەلاین و واقعی گۆڕەپانی سیاسی ئەم قۆناغەی ئیستا.

**بەشی چوارەم:** دەرئەنجام و ڕێگاکانی چارەسەر.

# بەشی
# یەکەم

## ئاڵنگاری و گرفتە سەرەکیەکان کە لە توانای ئێمە دانین، لەگەڵ بەشێکی کورت لەڕێگا چارەسەر

گرفتە سەرەکییەکان:

دەکرێ بڵێین هۆکارەکانی پاشەکشە و لاوازی پڕۆژە و کاری ئیسلامی بۆ دوو بەش و بابەت و گرفتی سەرەکی دەگەڕێتەوە؛

یەکەم: گرفتە دەرەکییەکان.

دووەم: گرفتە ناوەکییەکان.

سەرەتا ئاڵنگاری و گرفتە دەرەکیەکان باس دەکەین، دواتر بەتێر و تەسەلی دێینە سەر هۆکارو گرفتە ناوەکی و ناوخوییەکان:

### گرفتە سەرەکییەکان

یەکەم: سیستەم و دیزاینی جیهانی دژی پڕۆژە و حیزبە ئیسلامییەکانن.

سیستەم و دیزاینی جیهانی وارێك کەوتوە، یان بڵێین کاریان بۆ کردووە و ڕێکیان خستوە، دژن بەهەموو پڕۆژە و کارێکی ئیسلامی، نەبەڕێگەی دیموکراسی و نەبەڕێگەی کارە مەدەنییەکان قبوڵیان نییە، پارتە ئیسلامیەکان بگەنە جڵەوی دەسەڵات، ئەگەر چی لە هەندێك شوێن گەیشتونەتە دەسەڵات، بەڵام هەر زوو، یان لەبەینیان بردوە، یان دژایەتی خۆیان بۆ ڕاگەیاندون. تا ئێستاش بە هەموو شێوەیەك

هەوڵی لەباربردنی دەدەن وەك ئەوەی وڵاتی میصر. لەم دیزاین و سیستەمە جیهانیەش گشتیان لەبەرامبەر پارتە ئیسلامییەکان یەکن، با لە ئایدیۆلۆژیا و بیردۆز و بوارە ئابوری و جوگرافیاش یەك نەبن و ناکوك بن، لەم بارەیەوە نمونەمان یەکجار زۆرە. سۆڤیەتی شیوعی و ئەمریکای سەرمایەداری و سینی کۆنفوشوسیوو چەپ و ڕاسترەوە توندڕەوەکان (اليمين المتطرف) یەکن بەرامبەر کارو پڕۆژەی ئیسلامی.

## چارەسەری ئەم ئاڵنگاری و گرفت و خاڵە لاوازە:

**بۆ چارەسەری ئەم گرفتە دەرەکییە پێویستمان بەهەنگاوی ژیرانە هەیە لەوانە:**

١- دژایەتی نەکردنی گشت فکرە و بیردۆز و ئاینزاکان لەسەرتاو لەیەك کاتدا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دژایەتی هەمو دژەکانی ڕانەگەیاند، کاری لەسەر لێك جیاکردنەوە و پەرتکردنی هاوپەیمانیەتییەکان کرد، ئەگەر پێویست بوایە هەندی گرێبەستی لەگەڵ هەندێکیان بکردایە بەدانی بەرامبەرێك دەیدانی، وەك ڕوداوی جەنگی خەندەق، کاتێك دوو سەرکردەی هۆزی (خەتەفان) یان نارد (عویینەی کوڕی حصن، حارسی کوڕی عەوف)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئامادەبو یەك لەسەر سێی بەرو بومی مەدینەیان بداتێ، تەنها بۆ ئەوەی زۆربەی هۆزو قەبیلە و عەشیرەتەکانی بەرامبەر بەهێزو یەك بون، هەروەها بۆ ئەوەی لەیەك کاتدا شەڕی هەمووان نەکات[1].

دوای ئەوەی هاوپەیمانی کرد لەگەڵ قەبیلەکانی (چەمرە و جەهینە و غەفار) لەبیابان. ئینجا لەگەڵ قورەیش کەوتە جەنگی بەدر، هەنگاوی هەڵنەگرد بۆ رزگار بون لەبەنی قوریزە، تەنها دوای سەرکەوتنی لە جەنگی ئەحزاب و ڕەواندنەوەی مەترسییەکانی قورەیش.

٢- دەکرێ سود لەیاساکانی مافی مرۆڤ و یاسا نێو دەوڵەتیەکان و دەستور و چوارچێوە یاساکان بەگشتی وەربگرین، بۆ خۆچەسپاندنی خۆمان، واتا ململانێی

---

(١) بۆ ئەم بەسەرهاتە بگەڕێوە بۆ فەرمودەی جەنگی خەندەق لەصحیحی بوخاری» ژمارە (١٤٥٢٦).

کاری سیاسی لە چوارچێوەی یاسا بکەین، لەزمەی نایاسایی نەدەینە بەرامبەر. بەداخەوە بەشێکی زۆر لەتاکەکانی نێو پڕۆژە و کاری ئیسلامی شارەزاییان نییە لەیاسا نێودەوڵەتی و یاساکانی تری جیهانی، تالەوێوە بتوانن باشترین سود لەم بوارە وەرگرن.

٣- دەکرێ پارتە سیاسیەکان بە ناونیشانی زەقی ئیسلامی دروست نەکرێن، چونکە مەبەست گەیاندنی پەیامەکەیە نەك ناو، حیزب لەکۆتاییدا ئامرازە نەك ئامانج، بێگومان دەکرێ ئامرازیش شێوازو ئالیەتی جیاجیای بۆ بەکار بهێنی بۆ گەیشتن بەئامانج، لەمێژوی ئیسلامیشدا دەوڵەتمان هەبوە بەناوی ئیسلامی نەبوە، وەك دەولەتی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی وسەلجوقی و ئەیوبی و مەمالیك و تا دەگاتە ئەوانی تر، هیچ زانایەکی موسڵمانانیش لەم سەردەمانەدا ڕەخنەی نەگرتوە و نارەزایی دەر نەبڕیوە لەسەر ناو .

٤- خۆ پاراستن لەم هەنگاوانە کە چەوتن، هەندێ تاك دەیانکەن لەسەر پارت و حیزب دەکەوێ، دواتر بەتیرۆرو تۆقاندن لە قەڵەمی دەدەن.

٥- ڕوونکردنەوە و دیاری کردنی مەنهەج و بەرنامە و پەیڕەوی خۆی بەشەفافی، لە ڕێی دانوسان و گفتوگۆ و دیالوك، هیچ گرفتێك نیە پارتی سیاسی ڕێپێدراو بەڕونی بێتە گورەپانەکە، هەنگاوی سیاسی و کارو بەرنامەی خۆی ئاشکرا بکات، چونکە شتی نادیار چێگای گومان وترسی بەرامبەرەکانە، پێویستە ئەم گومانانە بڕەوێندرێتەوە بە گفتوگۆ و دیالوك.

٦- هەندێك لەم وڵاتانەی لەهەندێ مەفهوم و چەمك و بەرژەوەندی دوولایەنە نزیکن، ژیرانە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، هەوڵی مەداراتیان لەگەڵ بدرێت، بەلای کەم ئەگەر پشت گیریش نەبن بارێگر نەبن.

دووەم: زۆربەی پارتە سیاسیە عەلمانی و چەپەکانی جیهانی ئیسلامی سەر بە ڕۆژئاوان، یان خۆیان دروستیان کردووە.

لەدوای ڕوخانی خەلافەتی ئیسلامی ڕۆژئاوا چەندان سەرکردە و بیرمەندی لەجیهانی ئیسلامی هەڵبژارد و بەرەو ڕۆژئاوای بردن، بەشداری دەیان دەوراتی تایبەتی کردن، تا تەواو بونە پیاوی ئەوان و فکری عەلمانیەتیان هەڵگرت، بەرەو جیهانی ئیسلامی بەڕێکرانەوە، هەندێکیان لەناو سوپا و هەندێکیان لەشوێنەکانی تر حیزبی عەلمانیان دروست کرد، یان کودەتایان کرد بەسەر حکومەتەکان، تەنها بۆ ئەوەی بگەنە دەسەڵات و ئەوەی ڕۆژئاوا دەیەوێت جێ بەجێ بکەن، بەتایبەتی دژی پڕۆژەو کاری ئیسلامی، بۆیە پارتی سیاسی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی لەسەر مەبدء نەماون، زیاتر ئاڕاستە دەکرێن لەلایەن زلهێزەکانەوە، بەپارەو چەك و لۆجستی زۆرترین پاڵپشتی دەکرێن، هەمو زلهێزەکانی ڕۆژئاوا دژی پارتە سیاسیە ئیسلامییەکانن، هیچ جورە هاوکاری و یارمەتیکیان نادەن.

چـارەسەر:

ستراتیجیەتی سیاسی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبەرامبەر هێز و توانای ئیمپراتۆرو زلهێزەکان نەرمی و ئارامی و دان بەخۆ گرتن بوو، دوای (١٣) سەدە غاندی ستراتیجیەتی دان بەخۆداگرتنی پەیڕەو دەکات، کەواتە چارەسەری ئەم گرفتە بەخۆڕاگری و ڕاوەستاوی دەبێت لەسەر مەبدەئو خۆ نەفرۆشتن و خیانەت نەکردن، ستراتیجیەتی غاندی دوو ڕێگای هەبوو لەبەرامبەر داگیرکارە بەهێزەکانی، یەکێکیان: سەبر گرتن، با بەهێزەکان لێت بدەن، بتکوژن، هەرچی دەیکەن با بیکەن ئێوە خۆڕاگرن، دواتر بەم خۆڕاگریە چۆکی بە دوژمن دا، حیزبە ئیسلامیەکان لە ڕوی خیانەتی نیشتیمانی و داراییەوە پاك و بێ باکن، ئەم دوو خاڵەش بنەمای مەبدەئین، کومەڵگا و جەماوەریش بەسروشت لەگەڵ ئەو حیزبانەدان، پاڵپشتی حیزبی مەبدئی و پاك دەکەن، بۆیە دەبێ حیزبە ئیسلامییەکان، لەبەر ئەوەی کە حیزبە عەلمانیەکان سەر بەخۆ نین و لەسەر مەبدئ نەماون، خوڕاگر بن و خۆیان بەهیچ لایەك دا نەدەن، هەر ئەو حیزبانە

لەکۆتایدا براوەن، کە لایەنی بەرەی گەلن و خیانەتی نیشتیمانی و گەندەڵیان نەکردوە. لەکوتاییدا ئەم خاڵە بۆ حیزبە ئیسلامیەکان دەبێتە خاڵی بەهێز نەك لاواز.

### سێیەم: زۆری توانا و هێزو بازوی ڕۆژئاوا بەگشتی و پارتە سیاسییە عەلمانییەکان بەتایبەتی.

ڕۆژئاوا خاوەن هێز و تەکنەلۆژیا و تونایەکی لۆجستی خەیاڵییە، لەڕوی ماددیشەوە لە سنور دەرچوە، زۆربەی پارتە سیاسیە عەلمانیەکانیش لەلایەن ئەوانەوە هاوکاری مادی و مەعنەوی دەکرێن، لەبەرامبەردا پارتی سیاسی ئیسلامی کاتێك سەر هەڵدەدەن تەنها هێزی عەقیدەو تەدەیون و جەماوەریان لەگەڵە، هیچ پاڵپشتێکی نێو دەوڵەتی و ئیقلیمی و ئابوری و لۆجستیان نییە، بەهۆی نەبونی ئەم سەروەت و تواناياتە زۆر جار تاکەکانی ئیستغلال دەکرێن، ڕایان دەکێشن بەلای خۆیان، لەکاتی هەر ڕوبەڕو بونەوەیەك لەبەر هێزی ئەوان خۆناگرن و دەکەونە ژێر ڕکێفی ئەوان.

### چـــارەسەر:

بیرکردنەوەی ستراتیجی لەمیزانی هێز لەناوچەکە و دیراسەکردنی وەك سونەتی جەنگ، هۆکاری سەرەکی سەرکەوتن و ژێرکەوتنە، قورئان ئەم حەقیقەتە ستراتیجیەتەمان بۆ باس دەکات ، موازەنەی هێزمان بۆ دیاری دەکات لەنێوان دوو ئیمپراتۆریەتی جیهانی ، فارس و ڕۆم دەفەرموێت: ﴿ الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥ ﴾[١].

لێرەدا دوو ئیمپراتۆر حوکم دەکەن لەجیهان، چونەتە نێو جەنگێك کۆتایی هات بە سەرکەوتنی فارس بەسەر ڕۆم، دوای جەنگێکی تر دوای دە ساڵ بەرپا دەبێت کۆتای

---

(١) سورەتی الروم: ١ – ٥.

دێت بەسەرکەوتنی ڕۆم بەسەر فارس، ئەم دوو شکستە دەرفەت دەڕەخسێنی بۆ هێزێکی نوێ بێتە مەیدان، موعادلەی ئەم دوو هێزە جیهانییە لەبەر چاوی پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم) ئینجا سوپای نارد، بۆ غەزوەی مۆتە ئەگەر ئەم شکستە سەربازییە نەبوایە، بەم هێزە کەمەوە دەبوە جەنگی نابەرامبەر، موسڵمانان نەیان دەتوانی بەم هێزەوە بچنە مەیدانی جەنگ لەگەڵ ڕۆم، ڕۆمیش ئەوەندە بەئاسانی گۆڕەپانەکەی چۆڵ نەدەکرد[١].

قوڕەیش و ئیمراتۆرە زلهێزەکانی وەك فارس و ڕۆم و ساسان و هێزەکانی ناوچەکە، تابلێی بەهێز و توانادار و خاوەن مادە و هێزی لۆجستی بون، کەچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەچاو ئەوان لەڕوی هێزی مادیەوە بێ پاڵپشت بو، بەڵام بەهۆی ژیری و دیراسەی واقیع و هەڵسەنگاندنی دۆخەکە و نەخشەڕێگای ورد و هەڵس و کەوت لەگەڵ دۆخەکە، توانی شوێن پێی خۆی قایم بکات و هەنگاو بنێت. هەروەها پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەم بابەتەی لە فەرمودەیەکدا بۆ چارەسەر کردوین دەفەرمویت: (لَا يَنْبَغِي لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يُذِلَّ نَفْسَهُ .قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يُذِلُّ نَفْسَهُ؟ قَالَ: يَتَعَرَّضُ مِنَ الْبَلَاءِ لَمَا لَا يُطِيقُ)[٢]. واتە : دروست نیە بۆ مروڤی موسڵمان خۆی زەلیل بکات، پرسیاریان کرد چون ئیماندار خۆی زەلیل دەکات؟ فەرموی ڕوبەڕوی هەندێ شت دەبێتەوە  کە لەتوانای دا نییە.

ئەم حاڵەتەمان هەیە لەشکستی فێتنام و جەزائیر، بگرە تا دەگاتە شکستی بزوتنەوەی تاڵیبان بەرامبەر ئەمریکا لەساڵی ٢٠٠١، لەبەر ڕەچاو نەکردنی هێزی نابەرامبەر. هەندی جاریش بەهەڵە لەئایەتی پیرۆزی خودا تێدەگەین کە دەفەرموێت: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ٢٤٩﴾[٣].

---

(١) بڕوانە: لماذا يفشل الإسلاميون سياسياً، ياسر الزعاترە، ٥١.

(٢) بڕوانە: المعجم الأوسط، ژمارە (ج٥-٢٩٤).

(٣) سورەتی البقرە: ٢٤٩.

ئەم یاسایە مەرجی تایبەتی خۆی هەیە، پەیوەندی بەلایەنی بەرامبەر هەیە، کە توشی داڕوخان و شلەژان بووە. وتەی (خودا لەپشتمانە) یان (خودا زایەمان ناکات) بەبێ ئامادەکاری لەسونەنەکانی خودا ، نەواقعیە و نەلەتاقی کردنەوەکانی جەنگ لەمێژوو پێکاویەتی، واتە لە دونیا بەڵام دواڕۆژ و پاداشتیان ئەمەیان بابەتێکی ترە..

کەواتە پارتی ئیسلامی هەر لەسەرەتاوە نابێ بکەوێتە دژایەتی بێ سنور لەگەڵ بەرامبەرکانیدا، تا شوین پێی خۆی قایم دەکات، پڕۆژەو بەرنامەی جەماوەری دادەڕێژێ، پڕۆژە و بەرنامەکانی لەنێوان خەڵك و جەماوەر قبوڵ دەبێت. پێغەمبەر (١٣) ساڵ لەمەککە ئارامی گرت، هیچ ڕوبەڕو بونەوەیەکی لەگەڵ دوژمنەکانی نەکرد، بەڵام لەکارو پڕۆژەی خۆی بەردەوام بوو، نەی هێشت هیچ تاکێکی موسڵمان هەرچەندە لەڕووی ئیمان و بازوشەوە بەهێزیش بون، وەك ابوبکرو عمر (رەزای خودایان لەسەر بێت) بەبیانوی تولّە کردنەوە هیچ کارێکی ناتەندروست بکەن، بەڵکو فەرمانی کرد کۆچ بکەن بو حەبەشە، یان فەرموی (صبرا ال یاسر ).

دواتر کە چوە مەدینە لەوێوە جێ پێی خۆی قایم کردوە و هێزی دروست کرد، هاتەوە مەکەی فەتح کردوو (٣٦٠) بتی تێك شکاندو ئایەتی: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾[١].ی خوێندەوە. کەواتە ڕاگەیاندنی جەنگ و دژایەتی هەر لەسەرتاوە هەڵەیە، زوو پارتەکە شکست دەهێنی و دەپوکێتەوە.

---

(١) سورەتی الإسراء: ٨١.

# بەشی دووەم

## خاڵە لاوازەکان لە چوارچێوەی مەنزومەی گشتی وەک: قیادە، ئیدارە، فکر، تواناو مهارات، ئیدارەی ململانی.

### گرفتە گشتییەکان

لەبەر ئەوەی پرۆژە و کاری سیاسی ئیسلامی کار بۆ گەیشتن بە دەسەڵات دەکات، لەهەمان کاتدا کاری سەرەکی ئیسلاح کردنی تاك و کومەڵگایە، ئاستەنگ و گرفتی زۆر و هەمە لایەنەی توش دەبێت، لەسەر ئاستی گشتی و تایبەتدا، هەرچەندە زۆر جار کادیرو تاکەکانی نێو حیزبەکانیش توشی ئەم گرفتانە بون، بەڵام درکیان پێ نەکردوە، یان بڵێین لێی نازانن، کە ئەم گرفتە لەکام لاو خانەدایە، بۆیە بەگشتی هەندێك لەم گرفتە گشتیانە باس دەکەین پێش ئەوەی بچینە سەر خاڵە ورد و ناوەکییەکان:

## یەکەم: گرفتی حیزبە ئیسلامیەکان لەسەر ئاستی مەنزومەی قیادی.

شاراوە نییە ئەمڕۆ زۆربەی حیزبە ئیسلامیەکان گرفتیان لە سەرکردەی تەنفیزی نییە، بەڵکو وەك د. شنقیتی دەفەرموێت: (وإنما هي في ندرة القادة التصوريين القادرين على بناء رؤية متجاوزة، يستطعون من خلالها وضع البدائل التى تخرج هذه الحركات من حالة الفوضى والجمود)[1]. واتە: بەڵکو گرفت لەکەمی سەرکردەی فکریە کە بتوانی بینای دیدگایەك بکات، کارو پرۆژەی ئیسلامی بباتە پێش و تێبپەڕێنی، چی گرەوە دروست بکات حیزب لە حالەتی فەوزا و بەستەڵەك ڕزگار بکات، دیارە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستان هێشتا فکرەی بەڕێوەبردن دامەزراوەیی نییە، کارو بڕیار زیاتر لە دەستی کەسی یەکەمە، واتە قائید، بۆیە پێشکەوتن و داکەوتن، لاوازی و بەهێزی، هەستانەوە و کەوتن، ئابوری و ئیدارە، سیاسەت و حوکم هەموی بولای ئەو دەگەڕێتەوە. پارێزەری تەواوی حیزب و کومەڵگایە، لەسەر ئەم بنەمایە میللەتان شانازی بەژیار و ئابوری و سێکتەرە سەرکەوتوەکانیان ناکەن، بەڵکو شانازی بەکەسی قائید و ناوەکەی دەکەن، دەیکەنە ڕەمزی گەلەکەیان، چۆن ئێمەش قائید (صلاح الدين) مان کردۆتە ڕەمز و پێناسە بۆ خۆمان.

بۆیە زۆربەی کێشەکان ڕوو لە قیادە دەکەن، لەکوردستان حیزبە ئیسلامیەکان کێشەی مەنزومەی قیادەیان هەیە، هەرچەندە لەوانەیە ئەم ڕەخنەیان لە هەمو ڕەخنەکانی تر پێ ناخوش تر بێ، بەڵام توێژەر کاتێك لەبابەتێك دەکۆڵێتەوە دەبێ ڕەچاوی ئینساف و ڕاستیەکان بکات!، نەکەوێتە داوی ڕازی کردن و موجامەلە لەسەر حیسابی حەقیقەت و ڕاستی.

---

(١) بڕوانە: الحركة الاسلامية في السودان، مدخل الى فكرها الاستراتيجي والتنظيمي، محمد مختار الشنقيطي، لا (١٩٠).

## زۆربەی سەرکردەکان دەرچوی بەشی زانستە شەرعیەکانن[١]

لە نێو کۆمەڵگەی ئێمە ڕێزی زۆر تایبەت هەیە بۆ مامۆستایانی ئایینی و مولتەزیمەکان، ئەمە نیشانەی دڵسۆزی و دینداری خەڵکی هەرێمی کوردستانە، بەڵام هەڵەیەك هەیە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە، ئەویش خەڵك وادەزانێ مادام بەهۆکاری ئەوەی دیندارە، قورئانی لەبەرە، مامۆستای ئاینیە، لەسەری مەجلیس دادەنێشی، لەپێشی خەڵك دەڕوات، کەواتە هەر ئەویش دەبێ لەهەمو جومگەکان سەرکردەبێ، ئەگەر پسپۆڕی ئەویش نەبی، عمر عبيد حسنە دەفەرموێت ( استدعى بطبيعة الحال تقديم الخطباء على الخبراء)[٢]. ئەمە گرفتێکی گەورەی بۆ کاری سیاسی ئیسلامی دروست کردوە، بزوتنەوە ئیسلامیەکان لەسەر دەستی ئەوان دروست بون، بەشێکیان زانای گەورە بون و شارەزایی زۆریان لە زانستە شەرعیەکان هەبوو، خۆمان بە قەرزاریان دەزانین، بەڵام لە ئیدارەدانی سیاسەت کردن لاواز بون، پسپۆڕیان لە سیاسەت نەبو، چوار دەوریشیان بەکەسانی وەك خۆیان شارەزا لە زانستی شەرعی پڕ کردبۆوە، لە

---

(١) مەبەستمان ئەوەیە، سەرکردەکان زانستی شەرعیان خوێندوە، مەنهەجی زانستی شەرعی ئەم سەردەمە باس و بابەتی پەیام و تەنزیرو ئابوری و ئیداری و سیاسی تێدا نییە، یان زۆر کەم گرنگی بەم لایەنانە دراوە، جاران مەنهەجی زانستە شەرعییەکان سیاسەت و فەلەکناسی و ئابوری و ڕیسالەی تێدابوو، دواتر دەوڵەتی ئیسلامی ئەم بوارانەی بەتەواوی پڕکردەوە، جیهاد و سنوری وڵاتی موسڵمانان و دبلۆماسیەت و ئیدارە و ئابوری پاراستنی شوناسی ئومەو شکۆی موسڵمانانی پاراست، خەڵك تەنها پێویستی بەزانایان بو تا بواری خواپەرستی و کڕین و فرۆشتن و باری کەسی و هەندێ ئادابی تریان بۆ ڕون بکەنەوە، بۆیە وردە وردە مەنهەجی زانستە شەرعیەکان بەم شێوازە گەیشت، ئیستا تەنها بەم مەنهەجە ناتوانی ئیدارەی سیاسەت و حوکم بکەی، ئەگەر دەڵین ئەدی ئەوە نییە شێخ سعید و قازی و ئەوانە دەرچوی زانستی شەرعی بون و سیاسەتیان کردوە، دەبی ئەوە بزانین هەمو سەردەمێك شێوازو سیاسەت کردن و پسپۆڕی و تواناکان دەگۆڕێن، ئەو کات بەرامبەرەکانیش بە شێوازی پسپۆری کاریان نەکردوە لەیەك ئاست دابوینە، جگە لەوەی دەوری خۆیان پڕکردۆتەوە بەکەسانی شارەزا و موماریس لە سیاسەتکردن، بەڵام ئەمڕۆ کاراکتەرە سیاسیەکانی بەرامبەر بەپسپۆری هاتونەتە مەیدان، دەبی موسڵمانانیش بەهەمان توانا یان زیاتر بچنە مەیدانی سیاسەت، ئەگەر نا هەمان چارەنوسی پاشەکشەمان دەبێ وەك ئەوەی ئێستا هەمانە.

(٢) بڕوانە: مراجعات في الفكر والدعوة والحركة، عمر عبيد حسنة، لا (١١٩).

بری خەڵکانی پسپۆر لەکاروباری سیاسی و کۆمەڵناسی و دبلۆماسی. لە دونیای عەولەمە هەر ڕوداوێك ڕوەدات با لە کیشوەری ئەوروپا و ئەمریکا و ئاسیاش بێت، ڕاستەوخۆ ئاسەوارو کاریگەری لەسەر شوینەکانی تریش دەبێت، ئەم ڕوداوە سیاسی بێت، یان ئابوری، یان سەربازی ....هتد بەشێك لەوانەی بەکاری ئیسلامی هەڵدەستن زانیاری شەرعیان هەیە (مەبەستم زانستی شەرعیە)، بێ شارەزابون لە زانستە مرۆیی و سەردەمییەکان، یان بەشارەزاییەکی کەم ناتوانن بەم هەموو ڕووداوە ڕابگەن و چارەسەری قەیرانەکان بکەن. گەمەی سیاسی ئەمڕۆ دیڕاسە و وردەکاری و داتابیس و لێکوڵینەوەو پسپۆڕی زۆری دەوێ، فۆرمی کارکردنی حیزبە ئیسلامیەکان لەڕوی بانگەوازو وتار و کارو چالاکی و تا دەگاتە سیاسەتکردن، فۆرمی ساڵەکانی هەشتاو نەوەتەکانە، دونیا گۆڕاوە و عەولەمە گوڕانکاری بەسەر هەموو جومگەکانی ژیان دا هێناوە، جاران هەر پڕۆژە و کارکردنێك لۆکاڵی و مەوزوعی بوو، ئەگەر وەك پێویستیش نەبوایە دەگونجا، بەڵام ئێستا دونیا بۆتە دێیەك، بیرو هزرو وتارو پڕۆژەکان دەبێ لە ئاست دونیای عەولەمە، گەشەی زانستی و تەکنەلۆژیایی سەردەم بن، بەم شێواز و فورمەی پێشوو، ئێستا دوچاری بەستەڵەك هاتون. هەر حیزبێك تەنها سەرکردەکەی پێشەوایەتی بکات، کەسی تر دەوری نەبی هەر کات سەرکردەکە ڕۆیشت حیزبەکەش کۆتایی پێ دێت. د. محمد عمارە دەفەرموێت (لانها بنت أمرها علی مواهب الشخص، لا علی بناء المؤسسة)[1]. واتە: لەبەر ئەوەی کاری حیزب بیناکراوە لەسەر تونای شەخسی، نەك لەسەر بینای دامەزراوەیی.

**قیادە کێیە:** لەبەر گرنگی و مەکانەتی قیادە، زاناکانی بواری فەلسەفەی سیاسی و زوبان و ئیدارە و کۆمەڵناسی و زانستە دەرونییەکان پێناسەی وشەی قیادەیان کردوە، بەڵام بەکۆی ماناکان ئەوەمان پێ دەبەخشن کە قیادە: (ئاڕاستە کردن و جوڵاندن و ڕێنوێنی کردنی خەڵکە بەرەو ئامانج و پێشکەوتن لەتەواوی بوارەکانی ژیان).

---

(١) بڕوانە: من مظاهر الخلل فی الحرکات الاسلامیە المعاصرە، د. محمد عمارە، لا ٢١٦.

## زەرەر و زیانی حیزبی تاکە سەرکردە :

زانستی ڕێکخستنی سەردەم سەلماندویەتی ئەو حیزبەی هێز و توانا و بڕیاری تەنها لەدەست کەسی یەکەم بی، جگە لەسلبیاتەکانی پێشو باسمان کرد ئەم زیانانەشی هەیە بۆ حیزب:

١- لەبری مەفهومی سەرکردە مەفهومی زاڵبون شوێنی دەگرێتەوە، واتە سەرکردە تەماشای دواوەی خۆی دەکات، ئایا هێشتا لەدوای دەڕۆن و گوێڕایەڵی ئەون، یان نا؟. بیری بۆپێشەوەچون و گەشە و پێشکەوتن نییە .

٢- سەرکردە هەوڵی لەناو بردن و دەرکردنی ئەوانە دەدات کە ڕای جیاوازیان هەیە لەگەڵی، هەندێك سەرکردە ئەوەندە توندن لەگەڵ موخالیفەکانی، لەگەڵ دوژمنەکانی وا توند نین، وەك سەرۆکی حیزبی ئیسلامی ئەفغانی (قلب الدین حکمتیار).

٣- سەرکردە لەدواکەوتەکانی دادەبڕێ، تەنها ئەوانە لەدەوری دەبن کە موجامەلەی دەکەن، ئەمەش وادەکات زانیاری دروستی ناو حیزبی پێ نەگات.

٤- دواکەوتەکانی، وتەکانی ورد ناکەنەوە و بیری لێ ناکەنەوە، (ومن شأن المستمعين إلى القائد المسيطر أن لا يفهموا كلامه فهما موضوعيا، لأنهم لايبحثون عن قيمة الكلام في ذاته، بل عما يقصده القائد ويريده) [1]. واتە: حاڵ و باڵی گوێگری تاکە سەرکردەکانی سەیتەرەیان کردوە، بەشێوازێکی مەوزوعی لە ماناکە ناگەن، لەبەر ئەوەی لەبەهای وشەکان ناکۆڵنەوە، بەڵکو بیر لەنیەت و مەبەستی سەرکردەکەیان دەکەنەوە.

٥- تا ئەم حیزبە ماوە بەدیلی بۆ دروست نابێت، کەواتە سەرکردە پێ ناگات. ئەمەش دەبێتە قەیرانی قیادە.

---

(١) بڕوانە: الحركة الاسلامية فى السودان، مدخل الى فكرها الاستراتيجي والتنظيمي، محمد مختار الشنقيطي، لا (١٩٢).

## چـــارەسەر:

بەهۆی نەبونی سەرکردەی کارێزما حیزبەکان توشی قەیرانی زۆر هاتون، سەرکردەکانیش ناتوانن لەکورسیەکانیان بێنە خوارێ بەناوی وەفاو پاراستنی یەك ڕیزی و کەس لەخۆ بەشارەزاتر و نەبونی بەدیل، بۆیە چارەسەر و گەشەی حیزب وەستاوە لەسەر سەرکردە، (هریر دکمیجیان) یەکێك لە پسپۆرە بەناوبانگەکانی ئەمریکی تایبەت بەمێژوی ناوەڕۆکی بزوتنەوە ئیسلامییەکان دەڵێت: (تطور الحركة الاصولية الاسلامية يستوقف على نوعية قيادتها السياسية والثقافية وفي الظروف الحالية تعانى الحركة بشكل جدي من القصور في قيادتها الفكرية والسياسية والتكتيكية)[١]. واتە: گەشەسەندن و پێشکەوتنی بزوتنەوە ئیسلامیەکان ڕاوەستاوە لەسەر جۆری سەرکردە سیاسی و ڕۆشەنبیرەکان، لە زروفی ئێستادا بزوتنەوە ئیسلامیەکان بەشێوەیەکی جدی دەناڵێنن لەبەر نەبونی سەرکردەی فکری و سیاسی و تاکتیکی. ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سروشتی وایە لە دەوری سەرکردە و کەسایەتی ناودار کۆدەبێتەوە، گوێی بۆ دەگرێ، گوێڕایەلی دەکات، هەروەها تاکەکانی ئەندام لە حیزبەکانیش هەر پەیوەستن بە سەرکردە، ئەگەر کەسی یەکەم سەرکردە پێشکەوتو بو، وشیارو سیاسیی و دانابو لەکاری سیاسی، ئەوا حیزبەکەش لەپێشە و سەرکەوت و سیاسییە، لەمەیداندا براوەیە، پێچەوانەکەشی بەپێچەوانەیە، تەنانەت تەماشای خێزانێك، یان قوتابخانەیەك، یان دەزگایەك، تا دەگاتە حیزب و دەوڵەتیش، ئەگەر کەسی یەکەم سەرکردەکە بەهێز بو ئەوا بە سروشت ئەوانە بەهێزن، ئەگەر سەرکردەکە لاواز بو، ئەوا بەسروشت ئەوانەش لاوازن. نمونەمان زۆرە لەجیهان.

**ئەم گرفتە بەو دوو ڕێگایە چارەسەر دەکرێت:**

**ڕێگای یەکەم:** سەرکردە بەخۆی کەسایەتیەکی قیادی و ئیداری و فکری و سیاسی بێت، لەیەك کاتدا هەمو ئەم سیفەتانەی لەخۆی کۆکردبێتەوە.

---

(١) بڕوانە: Islam in a revolution . Dekmjian، p 165.

**ڕێگای دووەم:** لەوانەیە سەرکردەکە لە یەك لایەن سیفاتی سەرکردەی تێدا بێت، لە لایەنەکانی تر لاواز بێت، دەتوانی بەم هەنگاوانە ببێتە سەرکردەیەکی بەهێز.

١- بیتانەیەکی بەهێز لە چواردەورەی خۆی کۆبکاتەوە. ڕاوێژکاری لاواز دوور بخاتەوە.

٢- ڕاوێژکاری پسپۆڕو شارەزا لە بوارە جیاوازەکان دابنێت. بە مەرجێك ڕاوێژکارەکان تەشریفی دانەنرابن، لەسەر ئەساسی پسپۆڕی لە بوارێکی تایبەت، کە سەرکردە لەم بوارە و پسپۆڕ نییە، هەروەها سەرکردە پرسیان پێ بکات نەك فێریان بکات.

٣- لەزۆربەی بابەتەکان بگەڕێتەوە بۆ ڕاوێژ کردن.

٤- بازنەی دووەم دابنێ، کۆمەڵێك خەڵکی سەرکردەی عاقڵمەندی تێدا بێ، لەخۆی پسپۆڕتربن، تەنها شوهەرەتی وەك ئەویان نییە. سەرکردەی سەرکەوتو بەردەوام خەڵکی بەهێزو بەتوانا لەدەوری خۆی کۆ دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بازنەی دووەم دروست بکات، (هنری فورد) دەڵێت: (إن احاطة القائد بأشخاص ناجحين تساعدة على النجاح)[1]. واتە: سەرکردە چواردەوری خۆی پڕ بکاتەوە بەکەسانی بەهێز یارمەتی دەر دەبن بۆ سەرکەوتنی. سەرکردەی شکلیش بەدوای خەڵکی لاوازدا دەگەڕێت.

**دروستکردنی بازنەی دووەم بۆ سەرۆك و کەسی یەکەمی حیزب.**

کاری سیاسی زۆر گشتگیرو هەمە لایەنە، بۆیە کەسی یەکەمی حیزب پێویستی بە زۆرترین پسپۆڕی هەیە لە دەوروبەری بن و ڕاوێژیان پێ بکات، بازنەیەك دروست بکات لە دەرەوەی حیزب ئاگادارو وشیارو خاوەن پسپۆڕی بن، لەهەر بوارێك دوو کەس دیاری بکات، لەکاتی پێویست بگەڕێتەوە بۆیان و ڕاوێژیان پێ بکات و قسەکانیان وەربگرێ. بۆ نمونە: دوو کەسی شارەزا لەکاروباری مزگەوت و بانگەوازی دیاری بکات، بۆ ئەوەی مانگانە بیانبینێ و پرسی مزگەوت و دەعوەیان لەگەڵ تاوتوێ بکات، کێشە و گرفت و هەنگاوی بانگخوازی و خاڵی بەهێز و لاوازیان لەگەڵ چارەسەر بکات، دوای بڕیاردان تەسلیمی دەستی ئەوانی بکات، ئەمە کاری

---

(١) بڕوانە: كيف تصبح قائدا ناجحا، ويليام هو وات، لا(٢٢).

سەرۆك ئاسان دەكات و ناكەوێتە هەڵەوە، زانیاریەكانی زۆر ورد و دەقیق دەبن. دوو كەس لەبواری دبلۆماسی ، دوكەس لە بواری پەیوەندی نێو دەوڵەتی، تا دەگاتە بواری یاسایی و فكری و ئابوری و سەرجەم بەشەكانی تر، ئەمەش كارێكی ئاسانە و سەركردە و سەرۆكەكان زۆر تێدا سەركەوت و دەبن، لەكۆتاییدا گەورەیی و بڕیار و خزمەتەكە هەر بەناوی ئەوەوە دەبێت.

دووەم: گرفتی حیزبە ئیسلامییەکان لەسەر ئاستی مەنزومەی ئیداری.

هەندێ گرفت هەن ڕووبەڕووی حیزبە ئیسلامیەکان بونەتەوە لەسەر ئاستی مەنزومەی گشتین نەك تاکەکان، یەکێ لەوانە گرفتی مەنزومەی ئیداریە، زۆربەی حیزبە ئیسلامیەکان لەگەڵ ئەوەی کە دونیا لە ڕوی زانست و زانیاری و گەیاندنەوە زۆر گۆڕاوە، تا ئێستا نیزامی ئیداری بەشێوازی هەڕەمی داخراو ماوە، ئەم جۆرە سیستەمە ئیدارییە بۆ زەمەنی خۆی باش بو، ئێستا ناتوانی ئیدارەی حیزب بەڕێوە ببات، جاران خەڵك چاوەڕێی سەرۆك و سەرکردە و کەسی یەکەمی دەکرد، تا هەموو زانیاریەکان لەوێوە دەربچن، یان چ بڕیار و ڕاسپاردە و تەحلیلاتی سیاسی و پێشهاتەکان وەك زانیاری لە ڕێی سەرۆکەوە بکاتە ئەندامەکان، ئێستا دونیا بۆتە جیهانگیری و جیهانێکی کراوە، بەو شێوازە هەڕەمیە کاری ئیداری ناچێتە پێشەوە، حیزبی ئیسلامی دەبێ مەنزۆمەی ئیداری خۆی بباتە پێش و گەشەی پێ بکات، بتوانی سیستەمێکی ئیداری وا دابنی بتوانێ زانیاریەکان بە ئاسانی بگەینێ، هەروەها پەیوەندییەکان بەئاسانترین و سانا ترین کات بگەینێتە یەکتر، سیستەمی هەڕەمی ناتوانێ ئیدارە بەڕێوە ببات، چونکە خەڵك تەماشای ڕوداوو زانیاریەکانی دونیا دەکات بە چرکەیەك، ڕاناوەستی تا لەسەرۆکی حیزبەوە شۆڕ دەبێتەوە، لەوانەیە بەئاسانی نەکاتە ئەندامەکانی خوارەوە، بەتایبەتی ئێستا بەهۆی گەشەی گەیاندن، سیستمی ڕێکخستنی جاران لەناو حیزب نەماوە، هەروەها شێوازی بەڕێوەبردن و دانانی ئەندامان لەپۆست و پلە و ڕێکخستنیان، لەگەڵ چەندان گرفتی ئیداری بۆتە ئاستەنگی زۆر بۆ لاوازی کاری ئیسلامی، بەهۆی لاوازی ئیداری کەسی ناشیاو لەشوێنی گرنگ دادەنرێت ئەمەش کارەساتی گەورەی ئەمڕۆی بەشێکی زۆرە لەحیزبە ئیسلامیەکان.

چـــارەســـەر:

ئەمڕۆ سیستەمی ئیداری بۆتە خاڵی جەوهەری سەرکەوتنی کاری دەوڵەتداری و سیاسی و حیزبایەتی، بۆیە لە زانکۆکانی جیهان کۆلێژ و زانکۆی تایبەت کراوەتەوە

بۆ بەشی ئیداری، کەسانی پسپۆر خاوەنی ماستەرو دکتۆران لەم بوارە، بۆیە حیزبی ئیسلامی دەبێ لە بازنەی ڕۆتینیات و بەڕێوەبردنی ڕەمەکی و عەشایری بچێتە دەرەوە، کاری ئیداری کارێکی تەنفیزیە، تەنزیری نییە، با بیداتە خەڵکی پسپۆر بەڕێوەی ببەن.

هەروەها بەشی کاروباری سیاسی لەکاروباری ئیداری جیاکاتەوە ، ئەوانەی سەرکردەی سیاسین، سەرقاڵن بەکاروبارو تاوتوێی سیاسەتکردنەوە تێکەڵ بەکاری ئیداری ناوخۆ نەبن، ئەوانەی سەرکردەی کاری ئیدارین، کاروباری ناو حیزب وەك ئیدارەدانی نوسینگە و ڕێکخستنی ئەندامان و بارەگا و تەمویل و پەیداکردنی پاڵپشتی ماددی و کارە ناوخۆییەکانی حیزب بەڕێوە ببەن، بۆ ئەوەی سەرکردەی سیاسی خەریکی کاری ئیداری نەبێ، وەسەرکردەی ئیداریش کاری سیاسی تێك نەدات. ئەم جۆرە تەجروبەیە لەسودان تاقیکرایەوە سەرکەوتو بو، دوو دەستەیان دانا دەستەی مەکتەبی سیاسی و دەستەی مەکتەبی ئیداری، مەکتەبی سیاسی کاری لەسەر بابەتە سیاسیەکان دەکرد و تێکەڵ بەکاری ئیداری نەدەبو، مەکتەبی ئیداریش کاری ناوخۆی حیزبی دەکرد و تێکەڵ بەبابەتە سیاسیەکان نەدەبو[١].

---

(١) بڕوانە: الحركة الاسلامية في السودان، مدخل الى فكرها الاستراتيجي والتنظيمي، محمد مختار الشنقيطى، لا (١٢٠).

## سێیەم: گرفتی حیزبە ئیسلامیەکان لەسەر ئاستی مەنزومەی فکری.

پێداچونەوەو موراجیعاتی فکری لە هەر حیزب و گروپ و تاکێك و شوینێك بکرێت، بەڵگەیە لەسەر فکری تەندروست و ژینگەیەکی ڕۆشەنبیر و تەکانی نۆیکاری، هەر کات پێداچونەوە و موراجیعات وەستا ئاماژەیەکی ترسناکە بۆ بەستەڵەك بونی کاری ئیسلامی و ژەنگاوی بونی ئاستی ڕۆشەنبیری و فکری، ئەمەشیان بەسەر کاری ئیسلامی دەشکێتەوە بەتایبەتی، زەرەر لەسیستەمی فکری و کۆمەڵایەتی دەدات، ئەوەی ورد بێتەوە لەگۆڕانکاری لە نێو حیزب، یان تاك، یان کومەڵگا، دەزانی زۆربەیان بەکاریگەری ڕەخنەی زاتی و موراجیعات و بەخوداچونەوە هاتۆتە چێ، ئەمەش لەبەر ئەنجامی فکری ڕۆشنی زاناو فەیلەسوف و بیرمەند و خاوەن هەڵوێستەکان هاتۆتە دی، لەچەرخی دووەمی هیجری ئیمامی شافعی کتێبی ڕیسالە دەنوسێ، بەرهەمی نیقاش و موراجیعە و بە خۆداچونەوەیە لە بواری اسولی فیقهو فەتوا، بەرهەمی نیقاشی نێوان ئەهلی ڕەئی و ئەهلی حەدیس بوو. کردارە فکرییەکانی دیکارت و جۆن لۆك دەرئەنجامی نیقاش و موراجیعە و بەخۆداچونەوەیە.

## گرنگی موراجیعەی فکری بۆ حیزبی سیاسی ئیسلامی

هەر حیزب و بیرمەندێك، یان زانایەك موراجیعەی فکری خۆی بکاتەوە، نیشانەی جورئەت و ئازایەتی و تێگەیشتنی قوڵە لە دین و ژین، هەر کات مرۆڤ لەکارەکانی خویدا دۆگما بو، هیچ گۆڕانکاری بەسەر رەئی و بۆچون و بیرو ڕای دا نەهات، ئەوا ناخوێنێتەوەو دیراسەی قوڵی نییە، نایەوێ تەکان بەبواری فکری و زانستی خۆی بدات، ئەو بابەت و بوارە فکریانەی شوێن و مەجالی گۆڕانکارین و سەوابیت نین، لەگەڵ هەر زەمان و شوێن و زروف و سەردەم و تێڕوانینێك گۆڕانی بەسەر دادێت. لە هەشتاکان موراجیعاتی فکری قوڵ لەبەشێك لەحیزبە چەپەکانی جیهانی عەرەبی کرا، لەلایەن هەندێ کەسایەتی و چەند دەزگایەك لەفکرەی ئیشتراکیەت، کاریگەری لەسەر ڕەوتی ئیشتراکیەت دروست کرد.

لە پاشان شەپۆڵێکی موراجیعەی ئیسلامیەکانی بەدوا داهات، لە ڕوی دیدگای ئایینی و سیاسی، لەوانە جەماعەی ئیسلامی میسری ساڵی (١٩٩٧) زایینی، دیارترین سەرکردەکانی بزوتنەوەکە بەشداریان کرد وەك : کرم زوهدی، عصام درباله، ناجح ابراهیم، عاصم عبدالماجد، اسامه حافز و زۆرانی تر، هەروەها جەماعەی ئیسلامی لیبی (٢٠٠٧) ی زایینی، ناویان نا (الدراسات التصحیحیة)، بەم هەنگاوە شێخ عبدالحکیم بلحاج ئازاد کرا لە بەندینخانە.

ئەم بەخۆداچونەوە و موراجیعانە گۆڕانکاری گەورەی لەسەر حیزبە ئیسلامیەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دروست کرد لە بواری فکر و هەڵس و کەوت و تەنانەت فەتواش، بۆیە موراجیعەی فکری پێویستیەکی هەنوکەیی حیزبی ئیسلامیە لە کوردستان، بەتایبەتی لە دوای ڕوداوەکانی (١١) سبتێمبەر، هەروەها گۆڕانکاری و خۆپێشاندانەکانی بەهاری عەرەبی.

چونکە گۆڕانکاری بەسەر جیهان داهاتوە لە ڕوی سیاسی و ئابوری و تەنانەت سەربازیش، هەروەها جیهانگیری ململانێکانی گۆڕیوە و شێوازی کار کردن و هەروەها ململانێ فکری و سیاسیشی بەئاراستەیەك دا بردوە جیاواز لەپێش (١١) سێپتێمبەر، هەر حیزبێك ئاڕاستەی فکری لەڕوی کارکردنەوە لەهەمو سەردەم و کات و شوینێك یەك جۆر بی، ئەوا بێگومان بە پاش دەکەوێی و لەکاروان بەجێ دەمینێ. بەخۆداچونەوە لەڕوێکی تر لەنێو بزوتنەوە ئیسلامیەکان دەستی پێ کرد، دەتوانین ناوی بنین بەخۆداچونەوەی ستراتیجی ، لەوانە (اخوان المسلمین) لە میصر بەتایبەتی دوای گەڕانەوەی بۆ ناو کاری سیاسی لە٧٠کان، بۆ خۆ ئامادەکردن و خۆ گونجاندن لەگەڵ گۆڕانکاریە سیاسیەکان وهاوپەیمانی کردن و بەشداری هەڵبژاردن لەگەڵ تەیارو ئایدولۆژیای جیاواز، وەك هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبی (وەفد) لەساڵی (١٩٨٤)، هەروەها لەگەڵ حیزبی (العمل والاحرار). حیزبی (نەهزەی تونسی) لە٨٠ کان، ناوی حیزبەکەیان گۆڕی و شێخ ڕاشد الغنوشی چەندان کتێبی گرنگی لە بواری دیدگای ئایینی و سیاسی و فکری دەرکرد. ئەم بەخۆداچونەوانە ڕۆلی باشی بینی لە پێشکەوتنی کاری ئیسلامی لە تونس. لە هەردو حاڵەتدا

بەخۆداچونەوە و گۆڕانکاریە فکریەکان لەژێر کاریگەری زروفی جیاواز ڕوو دەدەن، هەندێکیان بەویست و فەهمی نۆیە، هەندێکیشیان واقیع پێتدەڵی هەڵەی. لە بزوتنەوە جیهادیەکانیش چەندان بەخۆداچونەوە کرا، لەوانە دکتور( فضل، یان بلێن، سید إمام الشریف) ئەمیری جەماعەی ئیسلامی پاکستان، لەساڵی (٢٠٠٧) بەڕائەتی خۆی دەربڕی لە زۆر فکرەکانی پێشوی لە بارەی جیهاد و حاکمیەت ..هتد [(١)]. ئەو بەخۆداچونەوانەی لەژێر فشار بوە کەمتر کاریگەری هەبوە، ئەوانەی پێش ڕوداوەکان بەخۆداچونەوەیان کردوە زیاتر قبوڵکراوە و کاریگەری کردوە.

دیارە لەڕوی فکریەوە زۆربەی بزوتنەوە ئیسلامیەکان دروشمی گشتی و بانگەشەی عاتفی دەوروژێنن، بەبێ ئەوەی دیراسە و لێکۆڵینەوە و تاوتۆی کردن بۆ دروشم و بانگەشەکە کرابێ، ئایا ئەم بانگەشەیە، یان ئەم دروشمە چەندە بۆ ئێستا گونجاوە؟ چی بەدوا دادێت؟ چۆن لەواقیع جێ بەجێ دەکرێت؟ لێکەوتەکانی چین؟ لەژێر چەتری سیستەمێکی عەلمانی چۆن پەیڕەو دەکرێت؟ دەتوانن بەم دروشمە هەڵسن؟ زۆر جار دروشم و بانگەشەکان تەنها بۆ زیادکردن و ڕاکێشانی زۆرترین ژمارەی خەڵك بوە، ئەم تاکانە لەسەر ئەم درۆشمە عاتفیانە پەروەردە کراون، کە چوتەنەتە نیو واقیعی بابەتەکە و دەوروبەر و کۆمەڵگا و تەنانەت بەشێك لەسەرکردەکانیش بۆیان دەردەکەوێ ئەمانە تەنها بانگەشەن واقیعی نین، یان هەر زو سەرکردەکان لەگەڵ ئەنسارەکانیان توشی تێك گیران دەبن و پەرتەوازەیی و جیابونەوە و پارچە پارچەبونی لێ دەکەوێتەوە، وەك بینیهان لە ڕابردوە. یان ململانێیەکی قوڵ لەسەر بابەتە جوزئیەکان دەکرا، هەمو ڕابوون سەرقال دەبو بەم بابەتە جوزئیە خیلافیە، دە ساڵان ململانێی حەڕامی مۆسیقامان کرد، دوای واقیع پێی سەلماندین و لێهاندا، ململانێی جوزئیاتی ئافرەتمان کرد بێتە سەر ڕاگەیاندن، دوای واقیع و زەرورەت پێی سەلماندین، واتە هەر خەریکی جوزئیات ، لەکاتێکدا دەبو گرنگی بەبابەتی ستراتیژی فکری بەهێز بدرابایە، پرسیارێك ئاراستەی دکتۆر عبدالله نەفیسی دەکەن لەبارەی

---

(١) بڕوانە: مراجعات الإسلاميين، دراسه في تحوّلات النسق السياسي والمعرفي، بلال التليدي. ومراجعات الإسلاميين في الميزان، مقالة ، خليل العناني.

سیاسەتی ئەردۆغان، دەوڵەتەکەی عەلمانیە یان ئیسلامی؟ لەوەڵامدا قسەیەکی جوان دەگێڕتەوە لەبارەی جوزئیات و کارکردن لەسەر شتە ستراتیجی و گرنگەکان، دەڵێت توشی ئەردۆغان بوم، لە بۆنەیەك پێم گوت تۆ ئێستا سەرۆك وەزیرانی نفوسەکی زۆرت لەبەر دەستدایە، دەسەڵاتت هەیە، ناو تورکیا زاهیرە و دیاردەیەکی زۆر عەلمانی و نائیسلامیە، شەقامەکانی هەموی دەرونی موسڵمانان بریندار دەکات، بەتەمای چ بکەی و چۆنی بگۆڕی؟ لە وەڵامدا گوتی هیچ ناکەم، لە ئێستادا کار لەسەر دوو تەوەر و کاری سەرەکی دەکەم، یەکەمیان: ئابوریەکی بەهێز بۆ هەمو تاکەکانی تورکیا فەراهەم دەکەم بەبێ جیاوازی، تا تاکی تورکیا والێ بکەم بەئاسودەیی بژیت، وەلائی بۆ حکومەتی تورکی هەبێ و خزمەتی بکات و بەهی خۆی بزانی، شانازی پێوە بکات. دووەم: دەرهێنانی تورکیا لەبەرەی رۆژئاوا بۆ باوەشی جیهانی ئیسلامی. ئەم دیاردانەی ئێستا وەك بەدڕەوشتی و کاری فاحیشە هەن، لەئەنجامی گەشەی ئەخلاقی کۆمەڵگا خۆیان نامینێن و دەتوێنەوە، وەك ئەم ماڵانەی لەناو مەکە هەبون و ناویان دەعارا بو، لەسەردەمی هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کاری گرنگتری ئەنجام دا، خۆی بەوانە خەریك نەکرد، دواتر بەئاسانی ئەم دیاردانە تاوانەوە و نەمان[١].

---

(١) چاوپێکەوتنێکی د. عبدالله نفیسی لەگەڵ کەناڵی (کاظمیة). لەبارەی ستراتیجیەتی ئەردۆغان.

ئاوڕێك لەسەرهەڵدان و گەڵاڵەی مێژووی فکری ئیسلامی و کاریگەری لەسەر ڕابوونی ئیسلامی لەکوردستان، بەئاڕاستەی موراجیعات و بەخۆداچونەوە.

لەکۆتایی چەرخی نۆزدە غەزەوات و داگیرکاری و تەبشیر لە لایەن نێردراوە مەسیحیەکانی ڕۆژئاواو ئەمریکا ڕوی لە جیهانی ئیسلامی کرد، هەروەها شەپۆلی فەلسەفاتی ماددی و بێ دینی، نەزەعاتی ڕۆژئاوایی لە جیهانی ئیسلامی لەلایەن ڕۆژئاواوە زۆر بە فراوانی دەستی پێ کرد، ئەم داگیرکارییە کاریگەری لەسەر عەقیدە و ئەخلاق و خواپەرستی و فکری موسلمانان دروست کرد، هەر لەو کاتەوە بۆ ڕوبەڕو بونەوەی ئەم شەپۆلە داگیرکارییە فکریە، کۆمەڵێك بیرمەند و زانا و ئیصلاح خوازی وەك شێخ جمال الدین افغانی (١٨٣٩-١٨٩٦)، و شێخ محمد عبده (١٨٤٩-١٩٠٥)، و محمد ڕەشید ڕەزا (١٨٦٥-١٩٣٥) پەیدا بون، بەفکرو ئالیەت و دیدگای جیاواز ڕوبەڕوی ئەم غەزوە فکریە بونەوە. بەم شێوەیە دەبینین، شێخ جمال الدین ئەفغانی لبنەی یەکەمی فکری ئیسلامی داڕشت، بەناوی (بەرەنگار بونەوەی داگیرکاران)، (المقاومة للاستعمار)، هەروەها لوبنەی یەکەمی فکری ئیسلامی شێخ محمد عبده، ڕوبەڕوبونەوەی ئەوانەی قبوڵی داگیرکاران دەکەن، (المقاومه للقابلية للاستعمار)، لەم ڕووەوە شێخ جمال الدین کاری لەسەر یەکخستن و یەکڕیزی موسڵمانان کرد، بەتایبەتی ڕێکخستنەوە و لێك نزیك کردنەوەی شیعەو سونە، ئەو کات دود دەسەڵاتی گەورە بون لە ئەستەنبوڵ و ئیران، بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ڕۆژئاواو ئەوروپا، لەو کاتەی شێخ جمال الدین سەرقاڵی کۆکردنەوەو یەکخستنی موسڵمانان بو لە میسر و فارس و هند و ئەستەنبوڵ، غەزوی فکری ڕۆژئاوا و ئەوروپا لەزۆربەی وڵاتانی ئیسلامی دا بڵاو بوبۆوە، شێخ محمد عەبدە هاوکاری مامۆستاکەی بو لەم پڕۆسەیە، چالاکی شێخ محمد عەبدە لەدوای داگیرکاری ئینگلیز بۆ سەر میسر لەساڵی (١٨٨٢) دەستی پێ کرد، چەند ساڵێك بەم هۆیەوە لە میسر دور خرایەوە.

بۆ درێژە پێدانی ئەم کاروانە فکریەی شێخ محمد عەبدە دوای (٣٠) ساڵ لەهەوڵ و بەردەوامی، شێخ ڕەشید رەزا دەستی دایە هەمان فکرەو درێژەی پێدا، بەڵام بەشێوازو ئالیەت و فکرو دیدگای جیاواز، نزیکتر لە فکری شێخ الاسلام ئیبن تیمیە بوو.

له سەرەتای چەرخی (٢٠)م بزوتنەوە نیشتیمانییەکان بەئیسلامەوە بەسترابونەوە و لێك جیانەدەکرانەوە، گەلی عەرەبی و جیهانی ئیسلامی بەرەنگاری داگیرکاری دەبونەوە لەژێر چەترو دروشمی ئیسلام، بزوتنەوەی جەزائیری لەجەزائیر، خەتابی لەمەغریب، سەنوسی لەلیبیا، مەهدی لەسودان، محمد بن عبدالوهاب لەجەزیرەی عەرەبی (سعودیە)، گشتیان کاکل و ناوەڕۆکیان و کەسایەتیەکان ئیسلامی بون.

له سەروبەندی کوتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤- ١٩١٨) خیلافەت هەڵوەشایەوە، دەوڵەتی عەلمانی ڕاگەیاندرا، کۆتایی بەسیستەمی سیاسی و حوکمی ئیسلامی هات، حوکمی عەلمانی شوێنی گرتەوە، ئەم ڕوداوە جیهانیی ئیسلامی شۆك کرد.

لەم کاتەوە هێزەکانی ئەوروپی و ڕۆژئاوا بەشێکی زۆری خاك و وڵاتی ئیسلامیان داگیر کرد، لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کرد، بەتایبەتی شام و عێراق. چەند بزوتنەوەیەکی بەناو نیشتیمانی لە میسر و سوریا و عێراق و هەندی وڵاتی عەرەبی سەری هەڵدا دژی داگیرکاریەکان، زۆربەی سەرکردەکانی ئەم بزوتنەوانە لەمەدرەسەی عەلمانیەکان و دام و دەزگا دژە دینەکان پەروەردەکرابون.

ئەم بزوتنەوانە بانگەشەی سیستەمی سیاسی ڕۆژئاوایان کرد، کاریان لەسەر بڵاوکردنەوەی فکری جیاکردنەوەی دین لەژین و دەوڵەت کرد، ئەمە سەرەتای بیرۆکەی فکری عەلمانی بو لەجیهانی ئیسلامی. هەر چەندە سەرەتا وایان نیشان نەدا، بەشێك لەگۆتارەکانیان بەناوی ئیسلامی وە بو، بەڵام لەژێرەوە ڕێك کەوتبون لەگەڵ ڕۆژئاوا، لەکۆتایدا سیستەمی کۆمەڵایەتی و فکری و تا دەگاتە ڕۆشەنبیری و سیاسیشیان کرد بەعەلمانی.

بارو دۆخەکە بەم جۆرە زۆر لەبار بو بۆ بڵاوبونەوە و کارو چالاکی تەبشیری، لە هەمو لایەکەوە دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی فکری تەبشیری، بزوتنەوە قەومی و عەلمانیەکانیش یارمەتی دەریان بون، گۆمەکە لەجیهانی ئیسلامی زۆر شڵەقا، لەلایەك خیلافەتی ئیسلامی ڕوخا، کۆتایی بەدەسەڵاتی ئیسلامی هات، لەولاوە عەلمانیەت بەفەرمی بوە سیستەمی دەوڵەتداری، جیهانی ئیسلامی دابەشکراو داگیر

کرا، کرایە چەند پارچەیەك و هەر پارچەی بەخشرایە وڵاتێك، بەتەواوی خەڵك و کۆمەڵگا بێ ئومێد بون، لەم زروف و شلەژانەدا بیرمەندو ئیصلاح خواز، باوکی بزوتنەوە ئیسلامیەکان، داهێنەری فکرەی ڕابوونی ئیسلامی، شێخ حسن البنا ئیخوان و المسلمین ی دامەزراند لەساڵی (١٩٢٨). ئیمام بەننا بوە یەکەم داهێنەرو دامەزرێنەری ڕابوونی ئیسلامی لەجیهان، بەبیرۆکەو فکری ئیسلامی جیاواز، ئەویش (شمول الاسلام) بوو، واتە بەجیهانی ئیسلامی و ڕۆژئاوای ڕاگەیاندن ئیسلام گشتکیرە و بۆ تاك و کۆمەڵگاو دین و دەوڵەتە، عەقیدەو شەریعەیە. کەواتە جمال الدین ئەفغانی فکرەی الاسلام المجاهیدی دانا، محمد عبدە درێژەی پێداو فکرەی نوێبونەوەی فیقە و تەفسیری دانا، محمد ڕەشید ڕەزا نوێبونەوەی سەلەفیەتی بەستاوە بەسیاسەتی نیشتیمانی، شێخ حسن البنا گشتکیری ئیسلامی دارشتەوە، بەشێوازێك جیهان بزانێ ئیسلام عەقیدە و شەریعەت و سیاسەت و ژیانە[1].

دەتوانین بڵێین ئەمانە ڕائیدی فکری سیاسی ئیسلامی بون، لەدوای ئەوان کۆمەڵێك بیرمەندو بزوتنەوەی تر پەیدا بون، بونە درێژە پێدەری بناغەی یەکەم، ئەوانیش مامۆستا سعید نورسی لەتورکیا و جەماعەی تەبلیغ، شێخ ابوئەعلای مەودودی لەهیند، هەروەها سید قوتب و محمد الیاس الکاندهلوی. هەر یەك لەوانە کاریگەری زۆر گەورەیان هەبو لە شوێن و وڵاتی خۆیان لەسەر پەرەپێدان و بەهیزکردنی فکری ئیسلامی دروست لە جیهانی ئیسلامی.

ئەمە کورتەیەك بو لەفکری سیاسی ئیسلامی ئەم سەردەمە، تاکو خوێنەر بەر چاوی ڕون بێ، بزانێ فکرە جیاوازەکان لەکێوە هاتون، مەدرەسە فکریەکان چەندە کاریگەریان لەسەر بواری فکری هەیە، ڕابوونی ئیسلامی لەکوردستان لە ڕوی فکریەوە چ پەیوەندی بەبیرمەند و مەدرەسە فکریەکان هەیە، هەروەها تا بزانین مەنزومەی فکری لەسەردەمێکەوە دەگۆڕدرێت بۆ سەردەمێکی تر، چونکە لەکۆتاییدا فکر زادەی عەقڵی مرۆڤە، دوای هەڵێنجاندن و تێڕوانین لە قورئان و سونەت.

---

(١) بڕوانە: الملامح العامة للفكر السياسي الاسلامي، د. طارق البشرى، لا (١٦٩). في كتاب الحركة الاسلامية رؤية مستقبلية اوراق في النقد الذاتي، د. عبدالله النفيسي.

## گرفتە فکریەکانی ڕابوونی ئیسلامیی لە کوردستان

هەندێ بانگەشەو چەمك لەڕوی فکریەوە بەکارهاتوە، خراوەتە گۆڕەپانەکە لەکاتی ڕوداوو پێشهاتەکان، ئینجا دەرکەوتوە ئەمانە زۆر کێشەی فکری گەورەن بە هەڵبەسێردراوی ماونەتەوە و چارەسەر نەکراون لەوانە:

**١- کاتێك بڕیاری جیهاد درا لەگەڵ حیزبێکی عەلمانی کوردستان، لەم نێوەندەدا کوژراو و دیل و گرتنی ماڵ و سامان هەبو، گرفتەکە لێرە سەری هەڵدەدا! ئایا کوژراوەکانی ئەوان زۆربەیان شایەتمانیان دەهێنا، نوێژو رۆژ و ڕوکنەکانی ئیسلامیان جێ بەجێ دەکرد! ئایا ئەمانە حوکمیان گوژراوی کافرن یان چی؟ ئەگەر بڵێین کافرن چەندان ئەکحامی فقهیان بەسەر دا دەسەپێندری، ئەی ئەم ڕوکنانەی ئیسلام چیان لێ دێت؟ ئایا ئەوانە وەك کافرەکانی قورەیشن؟ خۆ ئەوان هیچ بڕوایان بەخودا نەبو! ئەوانە بڕوایان هەیە؟. ئەم بابەتە فکریانە بەبێ وەڵام مابونەوە. لە ڕوی تیۆریەوە، وشەکە بەکار دەهات، بەڵام کە دەچوە باری عەمەلی دەیان گرفت دەهاتە پێش چارەسەر نەدەکرا.**

**٢- لەولاوە هەر لە هەمان کات هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبێکی عەلمانی وەك خۆی کرابو، لە ڕێزی ئەوان چەنگ دەکرا، شوینیان بۆ دەگێڕا، زۆر جار بۆ ئەوان دەکرا، یان لەژێر ئاڵا و سەرکردایەتی ئەوان بو، ئەی ئەمە چیە بانێك چەند هەوا نییە، ئەمانە هەموی ئیشکالاتی فکری قوڵن.**

**٣- ئەو دیلانەی دەگیران، چۆن مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ، ئەوانیش کافرن یان نا؟.**

**٤- ماڵ و سامان ئایا غەنیمەتە؟ جارێکیان هەندێك ماڵ گیرا، گەڕانەوە بۆ فەتوا، ئایا ئەم ماڵە کە گیراوە ناوی لێ بنێن چی؟ ئەگەر بڵێین غەنیمەتە کەواتە ئەمانەی بەرامبەرمان کافرن!!؟ ئەوە کۆمەڵێك لێکەوتەی تری لێ دەکەوێتەوە، ئەگەر بڵێین هەڵگەڕاوەن ئەوە کارەساتەکە گەورەتر دەبێ؟.**

٥- بە هەڵگەڕاوەدانانی ئەندامانی حیزبی عەلمانی چ لێکەوتەیەکی لێ دەکەوێتەوە :

١- هەڵگەڕاوە دەبێ هەڵس و کەوت و معامەلەی لەگەڵ نەکەی واتا کڕین و فرۆشتن.

٢- ماڵەکەی هەموی دەبێتە ماڵی موسڵمانان و موسادەرە دەکرێت.

٣- ئەگەر ژن و ژنخوازی لەگەڵدا کرا دەبێ هەڵیوەشێنیەوە. ئینجا بەهۆی تێکەڵی ئێمە لەکوردستان لەگەڵ عەلمانیەکان، ژن و ژنخوازی لەنێوانماندا هەیە، چەندان خوشك و کچ لەلای عەلمانیەکانە، ئەگەر بڵێ هەڵگەڕاوە، دەبێ هەموی هەڵوەشێنیەوە.

٦- گرفتی دەنگدان بەعەلمانیەکان ئایا کوفرە یان نا؟ ئەگەر کوفرە چۆن دوای هەر لەپەرلەمان دەنگەکان بەگشتی دەدرێتەوە حیزبە عەلمانیەکان بۆ پێك هێنانی حکومەت!!!.

٧- هەر لەسەر دەنگدان ئەگەر کوفرە؟ بابەتی وەلائو بەڕائە؟ ئەدی کاتێك هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبێکی عەلمانی دەکەی، بانگەشە بۆ لیستێك دەکەی کە عەلمانیە، داوا لەخەڵك دەکەی دەنگی بداتێ ئایا ئەمە کوفر نییە!!!. هاوپەیمانی کرا لەلایەن ئیسلامیەکانەوە لەگەڵ حیزبی عەلمانی و چەپەکانەوە، بەیەك لیست دابەزین و بانگەشەیان بۆ کرد، ئەمانە لەکاتێکی ئاسایی لەگەڵ وتار و خیتابی سیاسی تێکدەگیرا، تاکی ئاسایی تێ نەدەگەیشت، تا وای لێهات موتمانەمان لەدەست دا لەلای خەڵك. لەگەڵ سەدان گرفتی فکری تر کەتا ئێستا چارەسەر نەکراوە.

چوارەم: گرفتی حیزبە ئیسلامیەکان لەسەر ئاستی مەنزومەی کارامەیی (المهارات).

دەوڵەتی ئیسلامی گەیشتە لوتکەی شارستانیەت بەهۆی کارامەیی و خاوەن کەفائەت و پسپۆڕی و شارەزاکانی، چونکە گرنگی زۆری بەتواناو کارامەیی داوە، تالەناوخۆ خاوەن کەفائە و توانا هەبوبیَ بەکاری هێناوە، جگە لەوە سودی لە توانا و کارامەیی دەرەوەی خۆیشی بینیوە.

زانستی ڕێکخستن و ستراتیجیەتی حیزبی گرنگی زۆر بە دروست کردنی قیادە دەدەن (صناعة القائد)، ئەوانەی شوێنیان دەگرنەوە لەدوای خۆیان، گرفتی حیزبی ئیسلامی ئەوەیە گرنگی بەدروست کردنی دواکەتەکانی دەدات (صناعة الأتباع)، ئەوانەی جوان وشەکان دەڵێنەوەو تەلقین دەدرێن، بەبێ بیرکردنەوە جێبەجێ دەکەن.

هەمو حیزبێك کۆمەڵێك خاوەن تاقە و توانا و مەهاراتی بەهێزی تێدایە، دەبێ حیزب، یان سەرکردە دیاریان بکات و لە شوێنی خۆی دایبنێ. بۆیە کورت ترین پێناسەی ئیدارەدانی خاوەن مەهاراتەکان گوتراوە: (کەشف کردن و دیاری کردن و جیاکردنەوەی خاوەن مەهارات و تواناداراەکانە، دواتر گەشە پی کردن و ئیستیسمار کردنیانە لە شوێن و کاتی خۆی، هەروەها بەرزکردنەوەو گرنگی پێدان و تەوزیفکردنیان لە شوێنی خۆی ، بەپێی نەخشە و دیراسەیەکی ئامانجدار).

ئێمە چەندان تاقەو توانامان هەبو، یان بەهەدەر دران، یان نەمانتوانی گرنکیان پێ بدەین، ئێستا لەناو حیزبە عەلمانیەکانن، زۆرترین پانتایی نێو حیزبە تازەکان لەخەڵکی خاوەن توانای ئیسلامین، لەلای ئێمە ئیهماڵ کراون و کەس گرنگی پێ نەداون، یان بەشێکی گەورەی ڕاگەیاندنەکانیان پڕکردۆتەوە لەوێ.

بەنمونە: خەڵکمان هەبوە خاوەن تاقە و توانایەکی بەرز بوە، ڕێزی لێ نەگیراوە، ئێستا لەدەرەوەی حیزبی ئیسلامی حیزبێك بەڕێوە دەبات. هەمانە هیچ گرنگیەکی پێ نەدراوە کاتێك چۆتە دەرەوەی بازنەی حیزبی ئیسلامی، بۆتە سەرۆکی پەرلەمان

و هەر بەوتەی ئیسلامیەکان کەسێکی سەرکەوتو بوە لەکارەکەی. کەسانێکمان هەبوە تا ئیسلامی بوە، هیچ پێگەیەکی پێ نەدراوە، داتر بۆتە پارێزگاو شارێك بەڕێوە دەبات، هەر یەك لەوانە زیاتر لە (٢٠٠) هەزار دەنگیان هێناوە، بەڕای بەندە چونکە بانگراوندی ئیسلامیان هەبوە، بۆیە جێی موتمانەی خەڵك بوە، ئیسلامی بون مایەی موتمانە و ڕاستی و دڵسۆزی و دەسپاکی نیشانداوە بۆ خەڵك، بۆیە خەڵك دەنگی پێ داوە، بەڵام لەلای ئێمە هیچ گرنکیەکیان پێ نەدراوە.

## چـــارەسەر:

هەر حیزب و سەرکردەیەك ڕاوەستاوە لەسەر مەهارات و توانای توانا دارەکان، یەك کەسی توانادار دەتوانی حیزب بباتە لوتکە لە هەندێ کاتتدا، یان جاری واهەیە دەتوانێ لەنەخشە و پلانێك لە لەناوچون رزگارت بکات. وەك سەلمانی فارسی لەغەزوەی خەندەق بەیەك پێشنیاری ماهیرانە توانی غەزوەکە سەر بخات، دەولەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەترس ڕزگار بکات.

هەروەها خەباب بە پێشنیارێکی نەخشەی سەربازی غەزوەکەی بردە قۆناغی سەرکەوتن. هەروەها بەناسینی مەهاراتی عمری کوری خەتاب و حەمزە و خالیدی کوڕی وەلید لەشوین و وەزیفەی خۆیان ئیسلام چوە قوناغێکی تر.

کەچی لەلای حیزبە ئیسلامیەکانی ئێمە، کەسی خاوەن توانا، لەبەر یەك بۆچونی جیاواز پشت گوێ دەخرێت، دەروێشێك دەخرێتە شوێنی، چۆن ئەم جۆرە حیزبە سەر دەکەوێ و پێش دەکەوێ.

## هەڵبژاردنی خاوەن مەهارات و توانا دارەکان:

دەکرێ بەپێی تەمەن بێ، یان هەر لەمنداڵیەوە بەپێی سەرناسی دیاریان بکەی، یان بەپێی تاقی کردنەوە و حەزو ئارەزوی کەسەکان . وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) صەحابەکانی بەپێی توانا و خولیا و حەزی خویان تەوزیفی کردن، گرنگی تایبەتی پێدان، هەریەك لەوانە ناونیشانێکی دانێ.

ڕۆژئاوا لە (٥٠) کانی سەدەی ڕابردوو بڕیاری دا گرنگی بەخاوەن تواناکان بدات، سەرکردەی سیاسی و کومەڵایەتی و سەربازی و فکری دروست بکات، لە ڕێی کەشفکردنی خاوەن تواناکان. یەکەم کەس هەستا بەگرنگی دان بەم بابەتە (بیرمەندێك بو بەناوی (دیهان)، لەساڵی (١٩٥١)م لە ولایەتێکی ئەمریکی بەناوی (الیونس) ئەم هەنگاوەی نا، داوای لە مامۆستاکان کرد ئەو کەسانەی بۆ هەڵبژێرن کە تونای سەرکردایەتیان تێدایە، دواتر زانایەکی دەرون ناس چەند پرسیارێکی دانا بۆ ناسینی خاوەن مەهارات و تواناکان، بۆ ئەوەی بیانناسیتەوە و گرنکیان پێ بدات، لەبەر گرنگی پرسیارەکان بەکورتی باس دەکەم:

**١- ئەوانەی نەخشەڕێگایان هەیە لەژیانی ڕۆژانەیان.**

**٢- ئەوانەی توانای بڕیاریان هەیە. لەسەرەتاوە.**

**٣- کامیان گرنگی بەشوهرەت دەدات.**

**٤- کامیان دەیەوێ جەماوەری زۆر بێ.**

**٥- کامیان توانای لێکدانەوە و تێگەیشتنی ڕوداوە کۆمەڵایەتیەکانیان هەیە.**

**٦- کامیان خاوەن بیرۆکەی جوانەو لەلای ئەوانی تریش قەبوڵە.**

هەروەها: لە لێکۆڵینەوەیەك دا کەسێك ئەنجامی داوە بەناوی (جارکی)، لەسەر (٨٦) کەسی هەرزەکار لەتەمەنی (١٤- ١٦) ساڵ بون، ئەم سیفەتە سەرکردە جیاوازانەیان هەبوو :

**١- شکل و شێوازیان ڕێك و پێکە.**

**٢- گرنگی بەکاروباری کۆمەڵایەتی دەدەن و بەدواداچون دەکەن.**

**٣- دڵیان بۆ کارو چالاکی سەرکردە هەنگاو دەنێ.**

**٤- بەئاسانی پەیوەندی مرۆڤ دۆستانە دروست دەکەن.**

٥- جورئەتیان هەیە لە دەربڕینی ئەو بۆچونانەی بڕوایان پێیەتی.

٦- لەکاتی تورەیی دان بەخۆیان دەگرن و دەری نابڕن.

٧- زیرەکیەکی کۆمەڵایەتی بەرزیان هەیە.

٨- بە ئاسانی بڕیار دەدەن و خاوەن بڕیاری خۆیانن.[١].

---

(١) بڕوانە: رعاية النابغين في الاسلام وعلم النفس، د. ابراهيم مريی، لا(١٣٧).

پێنجەم: گرفتی حیزبە ئیسلامیەکان لەسەر ئاستی مەنزومەی ئیدارەدانی ململانی (ادارة الصراع).

گرفتی حیزبی ئیسلامی لە ڕووبەڕوو بونەوەی قەیرانەکان

هەڵسەنگاندنی ژیری و وشیاری تاك و کومەڵگا و میللەتان لەکاتی ڕوداوو پێشهاتەکان دەر دەکەوی، قوڵی ستراتیجیەتیش لە سیاسەتکردن و ئیدارەدانی ململانێکان ئاشکرا دەبن، پێمان خۆش بێ، یان نا، ئێستا ڕۆژئاوا چۆتە قوڵایەکی ستراتیژی زۆر فراوان و سەرکەوتوو، بەمەرجێك هەموو ڕوداوە سیاسیەکان بەلای خۆیدا ڕادەکێشێ، ئەوان دەزانن چۆنی دروست دەکەن، بۆچی و لەکیوەو بەرەو کێ، دەرئەنجامەکەی چیە، بەرەو کام ئاقار هەڵدەکات، سودی چەندە؟ هتد.....بەپێچەوانەوە موسڵمانان ڕۆژ بەڕۆژ پاشەکشە دەکەن، ڕوداوەکان لەسەر ئێمە تاقی دەکرێنەوە و تێدەپەڕن، نەك ناتوانین ئیدارەی بکەین و بەلای خۆمانی دا ڕابکێشین، بەڵکو روداوەکە تەواو دەبێ، هەر تێ ناگەین و ناتوانین بیخوێنینەوە، هۆکاری ئەمە چیە؟ بەکورتی:

**١- سادەو ساویلکەیی و عاتیفە بەسەرماندا زاڵە.**

**٢- هەموو شتێك بەسیناریۆ و لە قەڵەم دەدەین، هەرچی حەقیقەتە لێمان ون دەبی.**

**٣- نەبونی پسپۆری لە بوارە جیا جیا کاندا.**

**٤- ئەو قوتابخانەو مەنهەجانەی خویندومانە، ئیدارە و پەیام و فکری سیاسی و چونیەتی ململانی تێدا نیە.**

**٥- خۆ بەستانەوە بەیەك فکر و مەنهج ، ئەگەر (٥٠) ساڵیش بەسەری دا تێپەر بوبێ.**

**٦- هەڵاتن و خۆ دزینەوە لە واقیع، بەناوی دینداری و نەزەریەی دونیا هیچ نییە.**

**٧- لەبەر لاوازی جورئەتمان خۆ لەزۆربەی واقیعەکان دەبوێرین.**

**٨- ترسان لەبەرژەوەندیە تایبەتەکان لەسەر حیسابی بەرژەوەندی گشتی.**

**٩- هەستنەکردن بە بەرپرسیاریەتی، خۆشباوەڕی و بێ ئومێدی.**

**١٠- چۆك دادان لەبەرامبەر دەسەڵاتی ڕۆژئاوا. پێمان وایە هەرچی بیانەوێ دەیکەن.**

قەیرانی كاری ئیسلامی لەسەردەمی جیهانگیری.

دەبێ دان بەوەدا بنێین كە جیهانی عەولەمە زۆر ترین قەیرانی تێدایە، كوردستانیش بەهۆی هەڵكەوتەی جوگرافی و نەبونی كیانی سەربەخۆ، دابەشكردنی بە ڕێكەوتنامەی سایكس بیكۆ، زۆترین قەیران بەرۆكی گرتوە، ئەمانە وەك قەیرانی دەرەكی، دیارە هەر حیزب و ڕێكخراوێك بەدەر نییە لە دەیان قەیرانی ناو خۆش.

حیزبی ئیسلامیش لەم (٣٠) ساڵەی تەمەنی توشی دەیان قەیرانی ناوخۆیی و دەرەكی بۆتەوە، وەك پێویست حیزبەكە و سەركردەكانی نەیان توانیوە ڕوبەڕوی قەیرانەكان ببنەوە، چارەسەری بكەن. بۆ نمونە هەر لەسەرەتاوە قەیرانی باڵ باڵێن دروست بوو، تا لەئەنجامدا ئەم ڕابوونەی پارچە پارچە كرد، چەندان حیزبی لاوازی لێ پەیدا بوو، بۆیە گوتراوە سەركردە مەعدەنەكەی لەكاتی قەیراندا دەردەكەوێت، چارەسەری قەیرانی پێدەكرێت یان نا؟.

هەموو قەیرانێك سێ قۆناغی هەیە:

- قۆناغی پێش دورست بوون.
- قۆناغی كاتی قەیرانەكە.
- قۆناغی دوای قەیرانەكە.

ئێستا وەك جاران نەماوە هەر قەیرانێك لە جیهان ڕوودبدات بەشێوەیەێك لە شێوەكان كاریگەری خۆی دادەنێت لەڕوی سیاسی و فكری و كۆمەڵایەتی و ئابوری ... هتد، ئەگەر حیزب لاواز بێت لەڕوبەڕو بونەوەو چارەسەری قەیرانەكان باجی زۆر گەورە دەدات، ئەگەر پێش وەختە نەخشەو پلانی هەبێ خۆی بۆ ئامادەكردبێ، یان سەركردەی كارێزمای هەبێ، دەتوانی قەیرانەكە بخۆێنێتەوە، تێ بگات و نەخشەی كورت خایەن و درێژخایەنی بۆ دابنێ، بەئاسانی لێی دەرباز دەبێت، هەندێ جار دەتوانی قەیرانەكە بەسودی خۆی تەواو بكات. دیارە هەر لەسەرەتاوە قەیرانی ئابوری و باڵ باڵێن و ناڕونی لە دیدگاو شێوازی كاركردن بەرۆكی حیزبی ئیسلامی گرتوە، تا ئێستاش چارەسەر نەكراوە هەر درێژەی هەیە.

## شێوازی چارەسەری قەیرانەکان

هاتنی پەیام بۆ جەزیرەی عەرەب لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی فارس و ڕۆم و بیزەنتی کە دەسەڵاتەکەیان بۆ هەزاران ساڵ بووە. بێ گرفت و قەیران نەبووە، جگە لە قەیرانی جەزیرەی عەرەب و نەخوێندەواری و جاهیلیەت و پەرتەوازەیی و دەسەڵاتی عەشایری، لەگەڵ ئەم هەموو قەیرانە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) توانی بەسەر تەواوی قەیرانەکاندا زاڵ بێ، دەستەیەکی تۆکمە و دەوڵەتێکی بەهێزی لە نێو ئەم هەموو قەیرانە دورست کرد، کەچی ئێمە ئەمڕۆ بۆ چارەسەری هەر قەیرانێك قەیرانێکی تر بەرۆکمان دەگرێ، نەك قەیرانە دەرەکییەکان، تەنها ناتوانین قەیرانەکانی ناوخۆمان و لە نێو خۆمان چارەسەر بکەین.

### چارەسەری قەیرانەکان بە پێی نەخشەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

هەرکەس دیراسەی سیرەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکات، بۆی دەردەکەوێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم هەنگاوانەی ناوە بۆ چارەسەری قەیرانەکان، بەئاسانی بەسەر قەیرانەکاندا زاڵ بوە:

### یەکەم: پێك هێنانی گروپی کارا.

لەکاتی قەیرانەکان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستەیەکی کارای دانا بوو لە پیاوانی شارەزا و وشیار و تێگەیشتو، بۆ چارەسەر و ڕوبەڕوبونەوەی قەیرانەکان، گەورەترین قەیران لە سوڵحی حودەیبیە دروست بوو، زۆر بە ئاسانی چارەسەری کرد، هیچ دوبەرەکی و باڵ باڵێنی لێ نەکەوتەوە[1]. لەم ڕوداوە هەڵوێستی نێوان ابوبکر

---

(١) بڕوانە: صحیحی بوخاری ، (٣١٨٢) ، صحیحی موسلم ، کتاب الجهاد والسير، باب صلح الحديبه (١٧٨٥).

و عمرمان بۆ دەردەکەوێت، لەبارەی هودنەوە، (مصالحة) لەگەڵ بەرامبەرەکان، دواتر چارەسەرکردنی قەیرانەکە بەئاسانی.

ئێستا حیزب دەستە دروست دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، کێشەکەی پێ چارەسەر نابێ و قوڵتری دەکاتەوە، چونکە بۆ لای خۆی و خەتەکەی ڕای دەکێشێ، ئەگەر لەواقیع وابو باباسی عەدالەت و دادپەروەریش بکرێت، سودی نیە.

## دووەم: دیار کردنی ئامانج و ئامڕاز چارەسەری قەیرانەکانە.

بۆ هەر هەنگاوێکی کاری ئیسلامی چەند قەیرانێك چاوەڕێ دەکرێت بەرۆکت بگرێ، ئەگەر پێش وەختە نەخشە ڕێگای بۆ دارێژن، ئامانج دیاری بکەن، ئامرازەکان فەراهەم بکەن، ئەوکات هەر قەیرانێك بێتە پێش دەتوانی بەسەری دا زاڵ بێ. بەنمونە کۆچ کردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەورەترین هەنگاو بو، کاروانێکی پڕ لەئاستەنگ و ئاڵنگاری و قەیران بو، بەڵام بەسەر هەموو قەیرانەکاندا زاڵ بوو ، بەهۆی ئامادەسازیەوە[1]. ئێمە لەزۆربەی قەیرانەکان توشی شلەژان دەبین، چونکە تەوەقوعمان نەکردوە، خۆمان بۆ ئامادەنەکردوە، هیچ پلانێکیشمان نیەە بۆی!!!.

## سێیەم: نەخشە ڕێگا لەکاتی ڕوودانی قەیرانەکە.

هەر قەیرانێك کاتێك ڕوو دەدات لەکات و ساتێکی جیاواز، بە کۆمەڵێك هۆکاری ناوەکی و دەرەکی، هەمو ئەوانە پەیوەستن بەشێوازی چارەسەرکردنی قەیرانەکە، بۆ چارەسەری ئەم قەیرانە پێویستت بە نەخشە ڕێگایێك هەیە، وەڵامی ئەم پرسیارانە لەخۆ بگرێ، لەم کاتەدا بۆ روی دا؟ ڕەهەندەکانی چین؟ جۆری قەیرانەکە چەند و چۆنە؟ چەندە پەیوەندی بەئێمەوەیە؟ چۆن و بەچ ئالیەتێك ڕوبەڕوی ببینەوە؟ بەچ شێوازێك تێی پەڕێنین؟... هتد.

---

(١) بڕوانە: صحيح البخاري، باب الهجرة النبي و اصحابه الى المدينه، ژمارە (٣٩٠٥).

چوارەم: خۆڕاگری و نەشڵەژان لەکاتی قەیراندا.

لە سەرەتای هاتنی پەیامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، چەندان قەیران ڕوی لە هاوەڵەکان کرد، بەڵام بەهۆی خۆڕاگری و نەشڵەژانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی، هەموویان تێپەڕاند، تەماشای بەسەرهاتی خەبابی کوڕی ئەرەت بکە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چۆن فێری خۆڕاگری و سەبری کردن(١).

پێنجەم: هاندان و بەرزکردنەوەی ورەی تاکەکانی نێو حیزب.

لەکاتی ڕودانی هەر قەیرانێك شڵەژان و قەلەقی و دڵەڕاوکێ دورست دەبێت، سەرکردە دەبێ هانی تاکەکان بدات و ورەیان بەرزبکاتەوە. وەك ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە قەیرانی خەندەق کردی(٢).

شەشەم : داهێنان و هەڵوێستی جیاواز و بیرکردنەوە و چارەسەری تازە.

هەر قەیرانێك بیرۆکەو داهێنانی تازەی پێویستە، نابی بەهەمان بیرۆکەی کاتی شاخ قەیرانی نەوەدەکانی ناوشار چارەسەر بکەی. ئێمە چۆن لەساڵی (٨٠) کان بە وتار و  دانانی مێزێك، هەموو هەنگاوەکانەمان دەردەبڕی، ئێستاش لەم سەردەمی جیهانگیری و پێشکەوتنە هەمان شت دووبارە دەکەینەوە. کەچی پێش (١٤٠٠) ساڵ سەلمانی فارسی داهێنانێك دەکات، بە لێدانی خەندەق لە دەرەوەی مەدینە، هەمو عەرەب پێی سەرسام دەبن، دەزانن کەئەم داهێنانە لە وڵات وسەردەمی واندا نەبوە، ئەمەش بوە هێزێك بۆ دەوڵەتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کە ئەم دەوڵەتە توانای چارەسەری قەیرانی هەیە و داهێنان دەکات لەکاتی قەیراندا، بەم داهێنانە کۆتایی بە قەیرانەکان هات لەسەردەمی مەدینە(٣).

---

(١) بڕوانە: صحیح البخاری، علامات النبوه ، ژمارە (٣٦١٢) .

(٢) بڕوانە: مسند الامام احمد ، ژمارە (١٨٦٩٤).

(٣) بڕوانە: الطبقات الکبیر، محمد بن سعد بن منیع البصری الزهری، (ج٢ ص٦٦).

## حەوتەم: چارەسەری قەیرانەکان دەست بەجێ، بەبێ دواخستن.

چارەسەری هەر قەیرانێك دوا بخرێت قوڵ دەبێتەوە، کێشەکە ئاڵوز تر دەبێت، بۆیە دەست بەجێ پێویستی بە بیرکردنەوە هەیە، کۆ کردنەوەی پێشنیار بۆ هەڵبژاردنی باشترین ڕێگای چارەسەر، زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی نەکردن لە چارەسەری قەیرانەکە. باشترین نمونەمان بەسەرهاتی غەزوەی حونەین و هەڵویستی هاوەڵانە[1].

## هەشتەم: پێکهێانی لێژنەییێك.

بۆ هەرقەیرانێك لێژنەییێکی دیاری کراوی پێویستە ئەم کارانە ئەنجام بدات.

١- هۆکاری دورست بوونی قەیرانەکە.

٢- تەوەقوعکردنی قەیران.

٣- دانانی نەخشەییێك بۆ ڕوبەڕو بونەوەی قەیران.

٤- سود وەرگرتن لە ئەزموونی پێشووتر.

٥- دورکەوتنەوە لە هەڵەکانی ڕابردوو.

٦- نەخشەی بەدیل و هەڵبژاردنی باشترین.

٧- بیرکردنەوەی قوڵ و دورکەوتنەوە لە ڕەق کینە و شڵەژان.

## نۆیەم: گۆڕینی ئامڕازەکانی چارەسەری قەیران.

چەند ئامڕازێك دیاری بکە، ئەگەر یەك لەم ئامڕازانەی سەرەتا سەرکەوتو نەبو، دووەم و سێیەم ئامادە بێت، نەك لە ناکاو توشی حاڵەتێك بێت بەهەڵە چارەسەر دیاری بکەی.

---

(١) بڕوانە: بوخاری- كتاب-المغازي، باب عزوه طائف ، ژمارە (٤٣٣٠).

دەیەم: بنەمای (وأمرهم شوری بينهم).

ڕاستە لە دوای خیلافەی ڕاشیدی شورا خەلەلی تێکەوت، بەڵام چوار بنەمای ئەساسی لەهەمو سەردەمە زێرینەکانی دەسەڵاتی ئیسلامی کاری پێ کرا، بۆیە شارستانیەتی بیناکرد و دەسەڵاتی سیاسی لە چواردە قەرن، سەربەرزانە بەڕێوە برد، ئەوانیش وەحدەتی ئومەی ئیسلامی و سەروەری شەریعەت، سەربەخۆیی فقە و زانست لەدەوڵەتداری، سەربەخۆیی جیهانی ئیسلامی و دوور لەژێر دەستەیی ئیستیعمار[1]، بەڵام شورا بەداخەوە لە نێو ئێمەی ئیسلامی تاڕادەیەك تەنها بەشكڵ ئەم ئایەتە دەخوێنینەوە، وەك ناوەڕۆك و تێ گەیشتن جێبەجێی ناکەین، گرنگترین هەنگاو بۆ ئیدارەی قەیرانەکان ڕاوێژکردنە بەکەسی عاقڵ مەند و ژیرو خاوەن ئەزمون، ئێستا حیزبە ئیسلامیەکان توشی جۆرێك لە دەمارگیری بوینە، لەخەڵكی نێو حیزبەکەیان نەبێ هیچ ڕاوێژێك بەخەڵكانی تر ناکەن، یان راوێژیان پێ دەکەن بەڵام بەگوێیان ناکەن[2].

شیخ تورابی دەڵێت: (إن الحركات الإسلامية حتى في اشكال تنظيمها لا تضرب نموذجا صادقا للإسلام، فمثلا تجد إن القيادة غير شورية أو تجدها شوري شبه وراثية، وتجد علاقات المناصحة والمناصرة لا تمثل نموذجا للدولة الاسلامية التي يريدونها ولم أنهم نقلوا الصورة التى تقوم عليها جماعاتهم الى المجتمع لكانت صورة شائهة للاسلام)[3]. واتە: بزوتنەوە ئیسلامیەکان لەڕوی ڕێکخستنەکانیان نمونەیەکی ڕاست و تەواو نین بۆ ئیسلام، بۆ نمونە سەرکردایەتی کردنیان ڕاوێژکاری نییە، یان ڕاوێژکارییە بەڵام بۆتە میراتگرەوەیی، هەروەها دەبینین پەیوەندیە ئامۆژگاری و سەرخستنەکانیان نمونەی دەوڵەتی ئیسلامی نین، ئەگەر ئەم نمونانەی نێو حیزب بگوازنەوە بۆ نێو کۆمەڵگا ئەوە دەبێتە نمونەیەکی شێویندراو بۆ ئیسلام.

---

(١) بڕوانە: استراتيجية علمية للتيار الاسلامي، د. توفيق الشاوي، لا٤٠.

(٢) بڕوانە: اعداد القادة روية دعوية معاصرة، تێزی دکتورا – عادل عبدالله هندى (٣٧٦).

(٣) بڕوانە : الحركة الاسلامية في السودان، الهاشمي الحامدى ،لا٦٥.

## ڕۆژئاوا چۆن سەرکەوتوو بوە لە چارەسەری قەیرانەکان

ئەمڕۆ ڕۆژئاوا تەواوی قەیرانەکان دەخوێنێتەوە، ڕوبەڕویان دەبێتەوە، بەلای خۆیاندا ڕادەکێشی و سودی لێوەردەگری.

**بەکورتی چەند هەنگاوێك باس دەکەم.**

**١- نەخشەی ستراتیژی درێژخایەن بۆ قەیرانەکان.**

**٢- هەڵبژاردنی کاتی گونجاو بۆ روبەروبونەوەی قەیرانەکان.**

**٣- خاوەن بڕیاری یەك لا کەرەوە.**

**٤- خاوەن عەزیمەت و ورە بەرزی.**

**٥- داهێنان لە بیرکردنەوە.**

**٦- چارەسەری دەست بەجێ.**

**٧- سود وەرگرتن لە کەسانی ڕاوێژکار و خاوەن پسپۆر و شارەزا.**

**٨- بە دامەزراوە کردنی بابەتەکان .**

**٩- دابین کردنی توانای ئابوری.**

**١٠- خوێندنەوە بۆ هۆکاری دورست بونی قەیرانەکە.**

**١١- ئیدارەدانی قەیرانەکە ڕاستەوخۆ تا تەواو دەبێ.**

**١٢- ئامادە سازی دەرونی و سایکۆلۆژی بۆ تاکەکانی نێو کۆمەڵگا[١].**

---

(١) بڕوانە: ( القیادە وقت الازمات)، دانی کار ینبعی ص (٢٧).

## بەشی سێیەم

## خاڵە لاوازە ناوخۆییەکان بەشێوازێکی وردو هەمەلاین و واقعی گۆڕەپانی سیاسی ئەم قۆناغەی ئێستا

لە پێشدا ئاماژەمان بەوە کرد کە حیزبە ئیسلامیەکان کۆمەڵێك گرفتی دەرەکی و ناوەکیان هەیە، ئەو گرفتانەی کە ناوەکین کاریگەریان زور زیاتر کردوە لە پاشەکشەی کاروانی ڕابوونی ئیسلامی لەگرفتە دەرەکیەکان، ناهێڵی حیزب گەشە بکات و بیر لەداهێنانی سیاسی بکاتەوە، خۆی ئەوەندە تۆکمە بکات هیچ ڕەشە بایەك بەلاڕێی دا بەری، بەڵکو جار وایە کۆی حیزب سەرقاڵی ئەم گرفتە لاوەکی و ناوەکیانەن، هەر ڕۆژەی گرفتێك سەر هەڵدەدات، سەرکردایەتی و ئەندامانی باڵا پێی سەر قاڵ دەبن تا چارەسەری دەکەن، لەو لاوە گرفتێکی تری ناوخۆیی سەر هەڵدەدات، ئیتر ناهێڵێ بیر لەبەرامبەرەکانی بکاتەوە، نەخشەی درێژ خایەن دارێژێ، هەرچەندە ئەوان ئەم گرفتانە بەسادەو ساکار سەیر دەکەن، بەڵام لە ئەسلدا وانیە، ئەگەر حیزب ناوەڕۆکی بەهێز نەبێ ناتوانێ تەکانی سیاسی بدات، دواتر بەرەو پارچە پارچە بون دەچێت. لەم خاڵانەی خوارەوە یەك یەك گرفتی پاشەکشەی کاری ئیسلامی ئاماژە پێ دەکەین.

### گرفتی یەکەم: لاوازی دیدگا و بەرچاوڕونی (الرؤیا).

تا ئەم قۆناغەی ئێمە تێیدا دەژین بەشێکی زۆر لە حیزبە ئیسلامیەکان گرفتی دیدگایان هەیە، دیدگایان تا ڕادەیەك ڕون نییە و نازانن چیان دەوێ؟ بەرەو کێ دەڕۆن؟ چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ دۆستەکان بکەن؟ یان لەگەڵ نەیارەکان چۆن هەنگاو دەنێن؟ ئایا دەچنە ناو حکومەت و بەشدار دەبن؟ یان لەئۆپۆزسیۆن دەمێنێنەوە؟ ئایا

حیزبی ئیسلامی هاتوە بۆ گەیشتن بەحوکمی ئیسلامی، ئەگەر حوکمی وەرگرت کام حوکمداری دەکات ئێرانی، تورکی، ئەفغانی، سعودی، یان چ جۆرە حوکمێك دەکات، چۆن خەڵك دڵنیادەکەیەوە، یان تەنها بەدوای عەدالەتدا دەگەڕێن؟ ئایا کاری حیزبی ئیسلامی فەراهەم کردنی ئازادی و لەناو بردنی زوڵمە؟ یان تەنها پەروەردە؟ کار لەسەر تاك دەکات؟ یان گۆڕینی سیستەم؟ خێزان دەگۆڕێت؟ یان لەڕێی دەسەڵاتەوە گومەڵگا دەگۆڕێت؟ ئایا حیزبی ئیسلامی تەنها وەرەقەی فشارە بۆ بەرامبەرەکانی؟ یان پڕۆژەیەکی هەمە لایەنەو گشتگیری پێیە بەدیلە بۆ ژیان؟ ئایا ئەدەواتی گوڕانگاری لەنێو حکومەتدا دەکات یان لەدەرەوە؟ ئایا دەتوانی لەدەرەوەی حکومەت گۆڕانکاری بکات؟. ئایا حیزبی ئیسلامی چ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ ڕێکخراوەکانی فشار دروست دەکەن لەسەر دەسەڵات؟ دیارە ئەو ڕێکخراوانەی فشار دروست دەکەن پشت بەجەماوەر نابەستن، بەڵکو هەندێ ئیمکانیاتی دارایی و ڕاگەیاندن و لوبیات و پەیوەندیان هەیە، بەکاری دەهێنن بۆ چەند دەستکەوتێکی دیاری کراو، بەڵام حیزبی سیاسی پشت بەجەماوەر دەبەستێت، کومەڵێك ئامانج و دیدگای گەورەی هەیە، پروگرام و سەرکردەو مەنهەجی هەیە، پشتی بەجەماوەر قایمە، تێدەکۆشێ بۆ جەماوەر و دەستەبەر کردنی ئازادی، گرتنە دەستی دەسەڵات، دارشتنی کارنامەی سیاسی، چاکسازی و گوڕانکاری گەورە لە دەسەڵات و سیکتەرەکانی تری بەڕێوەبردن لە وڵات، ئەم جۆرە بیر کردنەوە و دیدگا فراوانە بۆ نەخشە ڕێگاو دارِشتنی پرۆگرامێکی گشتگیر بۆ ئەم دیدگایانە بێگومان زۆری غائیبە لەکاری ئیسلامی!!!. ئەگەر چی لەوانەیە دان بەم ڕاستیە نەنێن، یان بەلای کەم زۆر پێی نیگەران دەبن، بەڵام ئەمە ڕاستیەکی تاڵە، بەرهەمەکەی شیرینە دەبێ بگوترێ. بەشێکی زۆر لە حیزبە ئیسلامییەکان لە شلەژان و ئاڵۆزی و نادیاری دیدگا دەژین، دیدگایەکی درێژ خایەن و ئاسۆ فراوانیان نییە، لەهەر ڕوداو و گۆڕانکاریەك ئەوانیش بۆچون و دیدگایان دەگۆڕێ، کەواتە بەتەحدید نازانن چیان دەوی.

هەندێ جار حیزبی ئیسلامی دەکەوێتە هەڵەی دیدگاوە، پێی وایە جیهان لە فەراغی فکری و سیستەمی سیاسی دەژی، ئەو دێت پڕی دەکاتەوە، بەگوتاری

تێوری بانگەشەی (الاسلام هو الحل) دیتە مەیدان، داوای خیلافە دەکات، واتە یەك دەوڵەت، یەك قیادە، بۆ ئێستا کە ڕێژەی موسلمانان نزیکی دوو ملیار کەسە، دابەش بوینە بەسەر ٥٢ وڵاتی جیاواز، لەکیشوەرەکان، ئەمە زۆر نزیکە لەموستەحیل، قەرزاوی رحمەتی خودای لێ بێ دەفەرموێت ( الدولة فی الاسلام لیست صورة من الدول التی عرفها العالم قبل الإسلام أو بعده، إنها دولة متميزة عن كل ماسواها من الدول بأهدافها ومناهجها ومقوماتها وخصائصها، فهي دولة مدنية مرجعها الإسلام وعالمية ولا مانع أن تبدأ بدولة اقليمية فی قطر معين، ودولة شرعية دستورية، ودولة شورية، ودولة هداية، ودولة لحماية الضعفاء، ودولة الحقوق والحريات، ودولة المبادئ والاخلاق)[١].

هەروەها محمد المبارك دەفەرموێت: (ان الدولة الاسلامية تتصف بانها دولة عقائدية (عقيدة وفكرة ونظم وتشريع) وأخلاقية انسانية، وحضارية، ثابتة الأسس متطورة الأشكال تبعاً لاختلاف الأحوال وتبدل الأطوار الاجتماعية الثقافية)[٢]. شێوازی دەوڵەتداری و ئیدارەدانی و دام و دەزگای سەربازی و ئەمنی و میکانیزمەکانی بەتەواوی گۆڕاوە، لەولاوە دونیا بەفکرو سیستەمی سەرمایەداری و شوعیەت بەڕێوە دەچێت، هەمو جومگەیەکیان پڕ کردۆتەوە، گوازراوەتەوەش بۆ جیهانی ئیسلامی و ئەوان ئێستا حوکم دەکەن، پاڵنەری هێز لە جیهانی ئیسلامی پیشەسازی و تەکتەلۆژیاو دارایی و ئابوریە، ئەمانەش گشتی لەژێر سیستەمی سەرمایەداریە، هەر ئەمانەش هێزی سەربازی و هەواڵگری و ڕاگەیاندن و تەواوی بەشەکانی تر بەڕێوە دەبەن، بەم پێیە ئێمەش بەحیزبی ئیسلامیەوە کەوتوینەتە ژێر ئەم هەیمەنەیەو بوینەتە پاشکۆ، بۆ ئەم مەبەستە حەقی خۆیەتی لەخۆمان بپرسین چ دیدگایەکمان هەیە بۆ دەرباز بونمان لەم پاشکۆییە؟ چ دیدگایەکمان هەیە بۆ تێروانینێکی گشتگیر بۆ سیاسەتی دەولی و ئیقلیمی و ناوچەیی؟ هەروەها بۆ بزوتنەوە جەماوەریەکان و پێکەوە ژیان، لەگەڵ زلهێزەکان و هێزە مام ناوەند و جیاوازەکان.

---

(١) بڕوانە: فقه الدولة للقرضاوي ، لا ٣٠- ٥٣.

(٢) بڕوانە: نظام الإسلام الحكم والدولة ، محمد المبارك، لا ١٣٧- ١٤٤.

چـــارەسەر:

ئەوەی گرنگە حیزبی ئیسلامی دیراسەی جدی و وردی وڵاتانی نوێ جیهان بکات، شێوازی پێکهاتەو پایەو ئامرازەکانی، هەروەها پەیوەندی بەکۆمەڵگاو توێژە جیاوازەکانی چۆنە؟ چۆن ئیستیعمار بناغەی سەرەکی داناوە؟ ئینجا پەیوەندی بەئیمپریالزم و سەرمایەداری چیە؟ پەیوەندی لەگەڵ بەنگی دەولی و نەتەوە یەکگرتوەکان و ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی و دەولەی عەمیقەو پەیوەندیە نێو دەولەتیەکانەوە چیە؟، ئینجا دەتوانی دیدگای خۆی دارێژێ. بەداخەوە نابینم لەسەرکردە سیاسیەکانی ئەمڕۆی گۆڕەپانی ئیسلامی لەکوردستان ئەم دیدگایانە ڕەنگ بداتەوە لە وتارەکانیان، یان لە نوسراو و کۆڕ و سیمینارەکانیان.

گوتاری سەرکردەکانی حیزبی ئیسلامی زۆرینەکەی لە چوارچێوەی گوتاری ئەخلاقی و تەدەیون دەسورێتەوە، کەمتر برەو بەدیدگا دەدرێت، بەشێك لەوانەی پێگەی سیاسیان هەیە بونەتە وتاربێژ، وەك مەلایەك قسە دەکەن، ئەگەر لێی بپرسی دەڵێت خەڵك گوێ لەگوتاری سیاسی ناگرێت و بێ تاقەتە لەگوتاری فکری و سیاسی، بۆیە بەم بیانوە پەنا دەبەنە بەر گوتاری بەهای کۆمەڵایەتی، لەکاتێکدا حیزبی ئیسلامی پێویستی بە دیدگای سیاسی و سەردەمی هەیە، لەژێر ڕۆشنایی و تەحلیلاتی واقیعی و ناوچەیی و ئیقلیمی و دەولی، دەبێ حیزبی ئیسلامی و سەرکردەکانی تەحلیلاتی ورد و سیاسیانە و گوتاری دبلۆماسی هەمە لایەن و واقیعبینانەیان هەبێ، بەرچاو ڕونبن بۆ خۆیان و کۆمەڵگاش، بزانن بەرە و کێ هەنگاو دەنێن، لەکوێی واقیعەکەن، هێزو بازویان چەندە، لەگەڵ کێ دۆستن، لەگەڵ کێ دوژمنن، کام لایەنی ژیان دەتوانن بۆ کۆمەڵگا پڕ بکەنەوە، کار لەکام توێژی کۆمەڵگا بکەن، خیتابی سیاسیان چۆن بێ و ڕو لەکێ بێ. بەرەو چ ئاڕاستەیەك بێ، ئەمانە دیدگای ڕون و دیارن بۆ حیزبی ئیسلامی، نەك تەنها چاوەڕێی هەڵبژاردن و کورسی بکەن، تا چوار ساڵ بێ ئیش بمیننێنەوە، نەزانن چ بکەن، ئەگەر بەشداریان پی کردن بەپەلە کۆمەڵێك خەڵك ئامادە بکەن بۆ ناو حوکم، ئەگەر نا بەناچاری دەست بکەنەوە بەگوتاری ئۆپۆزسیۆن، بەبێ دیدگایەکی ڕون، هەلبژاردن و کورسی بەشێکی بچوکی کاری ئیسلامیە، جێگەی بایەخە، بەڵام لەژێر پرۆژەو دیدگای درێژ خایەن.

ئەو بزوتنەوە و ڕەوتانەی لە دونیادا دیدگایان دیارە ، (قسەمان لەسەر ڕاستی و دروستی و تەواوی کارەکەو کەسەکە نییە، قسەمان لەسەر بونی دیدگایە)، هێتلر دیدگای گێڕانەوەی شکۆی ئەلمانیا بو، شێعە دیدگای هەیە بۆ هیلالی شیعی، سونە لەعێراق بێ دیدگایە نازانی چی دەکات، غاندی دیدگای ئەوەیە بۆ کۆمەڵێك ماف لەڕوی یاساییەوە بگێڕێتەوە بۆ هندستان، دواتر ڕزگار کردنی هیندستان، نورسی دیدگای شکست پێ هێنانی فکری عەلمانی بو، لەبەرامبەر کردنە بەدیلی ئیسلام بۆ فکری عەلمانی[1].

---

(١) بڕوانە: لماذا يفشل الإسلاميون سياسياً، ياسر الزعاترە، ٦٦.

گرفتی دووەم: خاوەنداریەتی نەکردنی قەزیە و کەیسی جەماوەری (القضیة).

هەمو کۆمەڵگایەك بەسروشت لە قۆناغێك لەقۆناغەکان بەکەیسێك دەناڵێنێ، ژیانی دەکەوێتە مەترسیەوە، مافێکی لێ داگیر دەکرێ، بەردەوام بیری لەسەر ڕزگار کەرێکە لەم کەیسە ڕزگاری بکات، خودای پەروەردگار بەگەورەیی خۆی، ڕەچاوی کەیسی میللەتانی کردوە، چ کەیسێك باو و گرفت بو بێ پێغەمبەرێکی ناردوە، دوای یەکتاپەرستی، ئەم کەیسە کاری سەرەکی ئەم پێغەمبەرە بوە، بۆیە خەڵك بەگشتی دەوریان لێ داوە و پشتیانگرتوە بەنمونە؛

١- پێغەمبەر (هود) علیە السلام کاری سەرەکی کەیسی ڕوبەڕوبونەوەی ئەوانە بوە، کە خۆ بەگەورە زان و جەبەڕوت بون.

٢- پێغەمبەر (صالح) علیە السلام کەیسی بنبڕکردنی فەسادی تەبەنی کردوە، ڕوبەڕوی گەلەکەی بۆتەوە بۆ نەهێشتنی فەسادی و خراپەکاری.

٣- پێغەمبەر (لوط) علیە السلام ڕوبەڕوی گەلەکەی بۆتەوە، بۆ نەهێشتنی کەیس و گرفتی هاوڕەگەزبازی و فاحیشە.

٤- پێغەمبەر (شوعیب) علیە السلام ڕوبەڕوی گەلەکەی بۆتەوە، بۆ نەهێشتنی کەیسی ڕیباو قۆرغکاری، هەروەها کاری بۆ چەسپاندنی عەدالەتی ئابوری کردوە.

٥- پێغەمبەر (داوود) علیە السلام ڕوبەڕوی گەلەکەی بۆتەوە، بۆ نەهێشتنی کەیسی حوکمی هەواو هەوەس و یاسای دەستکردی مرۆڤەکان، هەروەها کاری بۆ چەسپاندنی حوکمی خودا کردوە.

٦- پێغەمبەر (ابراهیم) علیە السلام کەیسی ڕوبەڕو بونەوەی نەمرودی ستەم کاری تەبەنی کردوە، چونکە گرفتی زۆرینەی خەڵك بوە.

٧- پێغەمبەر (یوسف) علیە السلام، گرفت و کەیسی ئابوری وروژاند، کەگەورەترین کەیسی گەلی میسر بو، بوە ڕزگار کاریان، ئەوانیش چونە سەر دینەکەی، کردیانە سەرکردەی سیاسی خۆیان.

٨- پێغەمبەر (موسی) علیه السلام ڕوبەڕوی فیرعەون بۆتەوە، چونکە چەوساندنەوەی گەلەکەی لەسەر دەستی فیرعەون بوە، ئەمە کەیسی زۆرینەی خەڵك بوە، پشتی بێ هێزو موستەزعەفەکانی گرتوە.

٩- پێغەمبەر (عیسی) علیه السلام ڕوبەڕوی شیرك بۆتەوە و تەوحیدی ڕاگەیاندوە. چونکە شیرك باوترین کەیس بوە لەم کاتەدا.

١٠- پێغەمبەر (محمد) (صلی الله علیه وسلم)، دەوڵەتی ڕاگەیاندن، ستەمی هەڵگرت، کیسرا و قەیسەر و هرقڵ و ابوجەهلی ڕوخاند، کۆیلایەتی نەهێشت، گوتاری گشتگیری قورئانی سەدا سەد جێ بەجێ کرد. گەورەترین کەیسی جوڵاند کە جیهان بەگشتی و جەزیرەی عەرەب بەتایبەتی پێیانەوە دەیان ناڵاند، ئەویش قەزیەی کۆیلایەتی بوو، کەیسەکەی (دەرهێنانی بەندەکان بو لەبەندایەتی بەندەکان بۆ بەندایەتی خودا).

لە جیهان و ڕۆژهەڵاتی ناوەراستیش چەندان خاوەن کەیسمان هەیە، بەخاوەنی قەزیە ناسراونەتەوە، ئەگەر هەندێکیشیان سەرکەوت و نەبون، بەڵام خاوەنی قەزیەبون، لەوانەیە هۆکارێکی تر هەبو بێ بۆ سەرنەکەوتنیان، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەوانە خاوەنداری قەزیەیان کردوە، بەنمونە: ئیخوان المسلمین کەیس و قەزیەی (گشتکیری ئیسلام) یان هەڵگرت، دوای ئەوەی ڕۆژئاوا دینی لە سیاسەت و ژیان جیا کردەوە ، ئەوان هاتن گوتیان: ئیسلام، دین و ژینە، عەقیدەو شەریعەیە، ڕۆح و لاشەیە، عەقڵ و نەقڵە، سیاسەت و ئەخلاقە، دینداری و دەوڵەتە، پەروەردەو فێرکردنە، فکرو فەرهەنگە، شیعرو پەخشانە، جوانی و سروشتە،...هتد

تەحریر بەهەمان شێوە دوای ڕوخانی خەلافەت، لەگەڵ دروست بونیان دەست بەجێ قەزیەی گێڕانەوەی و دروستکردنی دەوڵەتی خەلافەتیان ڕاگەیاندن، لەهەر شوێنێکی دونیا کەسێك بەدوای ئەم کەیسە بگەڕابایە سەرنجی ڕادەکێشا. پارتی کەیسی ئۆتۆنومی بەرز کردەوە، دواتر کردیە سەربەخۆیی، بەردەوام وشەی ڕیفراندۆمی دوبارە دەکردەوە. لەبەرامبەردا یەکێتی هیچ قەزیەکی بەدەستەوە

نییە، زۆر تەنگاو بێ دەڵێ لامەرکەزی بۆ شاری سلیمانی، کەواتە خۆی بەخاوەنی کوردستان نازانێ. ئەوەی لە عێراق دەوری سەرەکی دەگێڕێت و جۆریك لەستراتیجیەت و قەزیەی بەدەستەوەیە لە ئێستادا موقتەدا سەدرە، قەزیەکەشی بریتیە لەبەعێراقی و بەعەرەبی بونی هێزو حکومەت و دام و دەزگاکانی، بۆ نمونە هەر لەسەرەتاوە هەر بابەتێك لەگەڵ وڵاتانی دراوسی و هەرێم باس کرابێ، قسەی ئەو ئەوەیە ئێمە لەگەڵتاندا باش دەبین، نامانەوی موچە ببڕین، بەڵام دەبێ عێراق یەك پارچە بێ، لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و تەواوی گوتارەکانی، تەنانەت لەگەڵ ئێرانیش هەمان وەڵامی هەیە، داوای بەعێراقی بون و عەرەبی بون دەکات، هەروەها پێی وایە دەبێ حەشدی شەعبیش سەر بەعێراق و عەرەبی و عروبی بێ، نەك فارس و ئێران. لەبەرامبەردا مالکی و عامری و خەزعەلی و ئەوانی تر، زۆر گرفتی ئەوان عێراق نییە، بەڵکو ئەو ئەجێندایانەیە کەپێیان سپێردراوە. وە هیچ ستراتیج و کەیسێکیشیان نیە بۆ عێراقیەکان. ئەمە وای کردوە ئەمانە لەلایەن گەلی عێراقەوە زۆر بوغزێنراون بن، بەدەستی ئێران لە قەڵەم دەدرێن. لەبەرامبەردا موقتەدا سەدر هەر کات بیەوێ خەڵك دێنێتە خۆپیشاندان، داوای عێراق و عێراقی بون دەکات، داوای دەرکردنی ئەمریکا و وڵاتانی بێگانە دەکات.

دیارە سەرەتا بزوتنەوەی ئیسلامی قەزیەی گێڕانەوەی حوکمی خودای تەبەنی کرد، کۆمەڵگا زۆر دەوری لێ دا، بەڵام شێوازی حوکمەکە چۆن بێ؟ کام جۆر بێ؟ پڕۆژەکەی چی بێ؟ ناوی چی بێ؟ ئەمانە هیچی یەکلا نەکرابۆوە بۆیە لە دواییدا وازی لێ هێنا.

ئەوەی قەزیەی هەبێ، نابی تەنها لەنێو کۆنگرە و نێوخۆیان و نوسراوەکانیان بێ، دەبێ بەردەوام کاری لەسەر بکات، لە هەمو خیتاب و وتار و باسێکیان ڕەنگ بداتەوە، پڕۆژەی درێژ خایەنی هەبێ، هیچ شتێك ڕای نەگرێ و ساردی نەکاتەوە، بەرچاوی رون بێ، بزانێ دوای چەند ساڵ دەگاتە چ قۆناغێك، ئەگەر ڕێگەی پێ گیرا چەندان بژاردەی تری هەبێ و نەوەستێ، ئەگەر کەسی یەکەمیش نەما هاوبیرەکانی تەواوی بکەن و درێژەی پێ بدەن.

چارەسـەر :

گێڕانـەوەی شکـۆی نیشـتیمان :

یەکێك لە قەزیە و کەیسە هەرە گرنگ و سەرەکی و گشتگیرەکانی خەڵکی کوردستان لە ئێستادا بابەتی نیشتیمانیە، دو حیزبی دەسەڵات نەیانتوانی هیچ خزمەتێك بەنیشتیمان بکەن، شکۆی نیشتیمانیان بەتەواوەتی شکاند، ئێستا ئینتمای هاوڵاتی کوردی بۆ نیشتیمان بە تەواوی لاواز بوە، ئەوەندە خاکفرۆشیان کردوە هیچ شکۆیەك بۆ نیشتیمان نەماوەتەوە، ڕابوونی ئیسلامی لەهەمو کەس شایستە ترە بەرگری لە نیشتیمانی خۆی بکات، بۆیە لەسەرەتا پێویستمان بە ئاوڕدانەوەیەکی کورتی مێژوویيە ئەویش ئەوەیە: لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕابوونی ئیسلامی لە کوردستان کۆمەلێك چەمك و زاراوە هاتنە پێشەوە وەك چەمکی نیشتیمان کە جاران گرنگیەکی ئەو تۆی نەبوو قسەی لە سەر بکرێت یان شی بکرێتەوە، یان لەلایەن ڕەوتە عەلمانیەکان بەشێوازێك بەکار هاتبوو، نەدەشیا ئێمەی موسلمانیش بەهەمان شێوە بەکاری بهێنین، هەمان شی کردنەوەی بۆ بکەین، یان زاراوەکان چەند پێناسەیەکیان وەرگرتبوو دوور بوو لە پێناسە و جەوهەرە راستەقینەکەی خۆی، یان هەر لە لایەن خودی خۆمانەوە وەك فکری ئیسلامی زیادەڕەوی، یان کەمتەرخەمیمان لە تێگەیشتن و شی کردنەوە و حوکم بەسەر دادانی ئەم چەمکە هەبووە، (الافراط، والتفریط)، ئەم تێگەیشتنەش کاردانەوەی هەڵەی لێ پەیدا بوو. تا ئێستاش ئاسەواری ئەم هەڵەیە بەسەر کاری ئیسلامیمان ماوە، لەوانەیە زەرەر و زیانی زۆری پێ گەیاند بیین، قوربانی زۆرمان لە پێناو دابێت ، خەڵکێکمان لەسەر ئەم هەڵەیە پەروەردە کردبێت، یان کۆمەڵگەکەمان وا لە ئێمە گەیشتبێ کە دژی نیشتیمانین و عەلمانیەت دلسۆز و رزگارکەری نیشتیمانە!!. تێگەیشتن لە هەر چەمك و زاراوەیەك دەروازەیە بۆ گەیاندنی بە شوێنی خۆی، پێچەوانەکەشی بە پێچەوانەوەیە، لەم سەدەیە کەم و دەگمەنە حزبێکی چەپ، یان عەلمانی بەرگری ڕاستەقینە لە نیشتیمان بکات، لەبەر بەرژەوەندی خودی خۆی و حزبەکەی کەمتر ڕەچاوی بەرژەوەندی نیشتیمان دەکات،

لە هەر کاتێك بەرژەوەندی خۆی کەوتە مەترسیەوە ئەوا نیشتیمان دەکاتە ئامراز بۆ گەیاندنی ئامانجی بەرژەوەندیەکەی خۆی، وەك بینیمان، بێ گوێدانە مەبدەئو ئامانج. دیارە بەرگری لە نیشتیمان عەقیدە و مەبدەئی دەوێ! بۆیە موسڵمانان لە هەموو کەس گونجاو ترن بۆ ڕزگاری نیشتیمان و بەرگری کردن. دەیان نموونەی زیندوەمان هەیە، لەم سەدەیە کە ئیسلامیەکان زیاتر بەرگری نیشتیمانیان کردوە و ئەوانی تریش خیانەت، لەگەڵ ئەوەش ئێمە لە کوردستان کەمتر توانیمان خۆمان بکەینە خاوەنی ئەم قەزیەیە، کۆمەڵگاش تەواو تێبگەینین کە ئێمە ئیسلامەکەمان لەسەری داناوین خیانەت لە نیشتیمان نەکەین و پارێزگاری لێ بکەین، ئێستا لە کوردستان خەڵکی تر خاوەنی ئەم قەزییەن زیاتر، لەسەرەتای ڕابوونی ئیسلامی بەهۆی نەبوونی دیدگایەکی ڕوون لەسەر نیشتیمان و هاووڵاتی بوون، بێ متمانەیی بۆ کۆمەڵگا دروست کرد بەرامبەر بە ئێمە، ئەم بێ متمانەییە بەرامبەر نیشتیمان و هاوڵاتی بوون بۆتە یەکێك لە هۆکارەکانی دەنگ نەهێنان و پاشەکشەی ئێمە، (بە داتای تەواو گەلی کورد لە کوردستان ٩٥٪ موسلمانە و موسڵمانی خۆش دەوێ بەلام ١٥٪ یان کەمتر متمانەمان پێ دەکات و دەنگمان پێ دەدات)، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تر مەسەلەی هاوڵاتی بوون لەم کرانەوەی دونیا و جیهانگیری بۆتە بابەتێکی زۆر هەنووکەیی و سەردەم، زۆر پێویست دەکات بە زوبانی شیرینی کوردیش چەند نوسراوێك هەبێت لە بارەی هاوڵاتی بوون ئەرك و مافەکانی لە ژێر چەتری ڕابوونی ئیسلامی، بۆ ئەوەی لە کاروانی دونیای پێشکەوتن و مەدەنیەت دا دوا نەکەوین. هیچ فکرە و ئایدولۆژیایەك بە ئەندازەی ئیسلام پشت ئەستور نیە بە شارستانیەت و مەدەنیەت و ماف و ئەرکی هاوڵاتی بوون، هەندێك ڕەئی و بۆچون خوشویستنی نیشتمانیان لە بازنەی جەریمە و تاوان داناوە، ئەم جۆرە بۆچونە بڵاو بۆتەوە پێویستە ڕاست بکرێتەوە، یان ئینتیمای شەرعی بۆ نیشتمان لاواز بوە، یان زیادەڕەوی لە ئینتما کراوە تا گەیشتۆتە ئاستی بێ شەرعی، لەدوای نەمانی خەلافەتی ئیسلامی و دابەش بوونی خاکی موسلمانان بەسەر چەند وڵات و ئیقلیمێك ، پەیدابوونی ووشەی وڵات ((الدولة)) پێویستە توێژینەوەی تایبەت لە سەر مافی دەوڵەت و سنورو شەرعیەتی دەوڵەت بوون بو میللەتەکان دیاری بکرێت، بە تایبەتیش مەسەلەی کورد، ئایا بۆی

هەیە دەوڵەتی هەبێ وەك میللەتانی تر، یان نا؟ .تائێستاش هەندێك لە برای موسلمانی عەرەب دەوڵەتی بۆ خۆی پێ ڕەوایە، بەڵام بۆ کورد، بێ شەرعی وپارچە پارچە بوونە!!. لەم سەردەمە کە دونیا تێکەڵیەکی بێ ئەندازەی بەخۆوە بینیوە، میللەتان لە چەندان وڵات تێکەڵ بوون، بەشێوازێك تەنها هاوڵاتی بوون پێکەوە کۆیان دەکاتەوە، دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت ئایا ئەرك و مافی هاوڵاتی بوون چیە؟ کێ هاوڵاتیە؟ ڕەهەندی هاوڵاتی بوون چیە؟ دەستوری مەدینە مافی هاوڵاتی بوونی تێدایە؟ بۆ ئەم سەردەمە چۆنە؟ .....هتد. لەئێستادا گێڕانەوەی شکۆی نیشتیمان باشترین کەیس و قەزیەیە، ڕابوونی ئیسلامی کاری لەسەر بکات و بیکاتە چەقی کاری داهاتوی خۆی، دیارە ئەمە تەنها دیاری کردنی قەزیەکەیە، بۆ شێواز و ئالیەت و جێ بەجێ کردنی پرۆژەی تایبەت و درێژ خایەنی دەوێت.

## گرفتی سێیەم: لاوازی خیتابی سیاسی.

گەورەترین هۆکاری دروست بونی حیزب، کاری سیاسیە، دیارترین کاری سیاسیش گەیشتن بە دەسەڵاتە، ئەگەر حیزب خیتابی گەیشتن بەدەسەڵاتی نەبی حیزب نیە و لە بەرنامە و کاری حیزبی نەگەیشتوە، بۆ گەیشتن بە دەسەڵات پێویستت بەخیتابێکی سیاسیانەی ڕون هەیە، پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) یەکەم هەنگاوی بەیان کردنی خیتابی سیاسی بوو، لەسەر کێوی صەفا بانگی کردن بۆ خیتابی نوێی سیاسی[1]. هەندێ لە پێغەمبەران (سەلامی خودایان لەسەر) خیتابیان تەنها بۆ قەومەکانیان بوە، ناوچەیی و سنور داربوە، بۆیە فەرمویانە: ﴿يَٰقَوۡمِ﴾، بەلام خیتابی کۆتا پەیام بۆ کۆی خەڵك بوە بەبێ جیاوازی، بۆیە فەرمویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا﴾، ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾. ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾. ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾، ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾. دەبو خیتابی سیاسی ئێمە کورت نەکرێتەوە تەنها لە خەڵکە مولتەزیمەکە، کۆی هاوڵاتی و ئاینە جیاوازەکان لەخۆ بگرێت و ڕو لە هەموان بکات، خیتابی سیاسی دەربڕینی ئامانج و دیدگا و قەزیەی حیزبە، بەرامبەرەکانت لەخیتابی سیاسی دەتخوێننەوە، هەڵس و کەوتت لەگەڵ دەکەن. ئەوانەی لەدونیادا خیتابیان هەبوە، ئەم خیتابە بۆتە ناسنامەیان. بە نمونە: هێتلەر دەستی بەرز دەکردەوە لەگەڵ چوار پەنجەکەی خیتابی دەدا، وەك ئەوەی بەخیتاب و زوبانی جەستە بەجیهان بڵێت دەست بەسەر جیهان دادەگرم، ئێران خیتابی بەردەوام لە چوارچێوەی دروستکردنی هیلالی شیعیە، بۆیە بەردەوام باسی پایتەختەکانی بەغدا، سەنعا، دیمەشق، بەیروت،

---

(١) بڕوانە: صحيح البخاري ، ژمارە ( ٤٧٧٠ )، لَمَّا نَزَلَتْ: {وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأقْرَبِينَ}، صَعِدَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ علَى الصَّفَا، فَجَعَلَ يُنَادِي: يا بَنِي فِهْرٍ، يا بَنِي عَدِيٍّ - لِبُطُونِ قُرَيْشٍ - حتَّى اجْتَمَعُوا فَجَعَلَ الرَّجُلُ إذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أنْ يَخْرُجَ أرْسَلَ رَسولًا لِيَنْظُرَ ما هُوَ، فَجَاءَ أبو لَهَبٍ وقُرَيْشٌ، فَقالَ: أرَأَيْتَكُمْ لو أخْبَرْتُكُمْ أنَّ خَيْلًا بالوَادِي تُرِيدُ أنْ تُغِيرَ علَيْكُم، أكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ؟ قالوا: نَعَمْ، ما جَرَّبْنَا عَلَيْكَ إلَّا صِدْقًا، قالَ: فإنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ فَقالَ أبو لَهَبٍ: تَبًّا لكَ سَائِرَ اليَومِ، ألِهذا جَمَعْتَنَا؟ فَنَزَلَتْ: {تَبَّتْ يَدَا أبِي لَهَبٍ وتَبَّ }.

دەکات. ئەردۆغان بەپێی خیتابەکەی گێڕانەوەی دوڵەتی عوسمانییە، هەنگاوەکانیشی پەلی کێشاوە بۆ هەرێمی کوردستان، سوریا، لیبیا، قوبرس، ئازەربایجان، ئاوی یۆنان.... هتد. ئەوروپا و وڵاتە عەربیە عەلمانیەکان تاوانباری دەکەن بەگێڕانەوەی خەلافەتی عوسمانی. ئەمانە هەموی لە خیتابی سیاسیان دەردەکەوێ. خیتابی سیاسی سەدر عێراقی عروبەیە، خیتابی سیاسی پارتی سەربەخۆییە، خیتابی سیاسی یەکێتی چونکە بێ دیدگان هەر ڕۆژەی خیتابێکە، جارێکیان جیاکردنەوەی شاری سلێمانیە، جارێکیان لامەرکەزیە،..هتد. حیزبی ئیسلامی ئێستا لە قەیرانی بێ خیتابی دایە، سەرێکیان خیتابی پەروەردەیە، جار جار دەگۆڕێ بۆ خیتابی جیاکردنەوەی سیاسەت لە دەعوە، کۆتا خیتابیان عەدالەتە، ئەم خیتابە بەهێزە بەڵام عەدالەت بەشێکە لە سیستەمی سیاسی ئیسلامی، نابێتە جێگرەوەی خیتابی گشتی، ناتوانی تەنها بەعەدالەت شوێنی خیتابێکی گشتگیر پڕ بکەیتەوە.

## چــارەســەر

دیدگا و قەزیە و خیتاب بەیەکەوە بەندن، هەرکات دیدگا هەبو قەزیەش دەبی، لەوێوە خیتاب ڕون و ئاشکرا دەبێت، هەر کات دیدگا لێڵ بو خاوەنداریەتی قەزیە وجودی نابێ، کەواتە خیتابەکەش ناجێگیرە و ڕون نییە، کەواتە هەر لەسەرەتاوە گرفتمان هەیە، بۆیە بۆ دیاری کردنی چارەسەری خیتابی سیاسی دەبێ بگەڕێینەوە بۆ دیاری کردنی دیدگا، لەوێوە خیتابی سیاسی بەڕونی دەردەکەوێ، حیزبی سیاسی واتە گەیشتن بەدەسەڵات، هەر حیزبێکی سیاسی نیەتی خیتابی گەیشتن بەدەسەڵات نەبی، حیزبی سیاسی نییە، وەك ڕێکخراوێکی کۆمەڵی مەدەنیە، کە سەقفەکەی سنورداره و ناتوانێ لە چوارچێوەی خۆی زیاتر فراوان بێت، خەڵکیش ئومێدی لەسەر هەڵچنی تا ببیتە دەسەڵاتی سیاسی، حیزبی ئیسلامی دەتوانی لە هەمو کات و ساتێك خیتابی سیاسی خۆی دیاری بکات، تا ئێستا لە خیتابی سیاسی حیزبی ئیسلامی بەڕونی داوای بەدیل بونیان نەکردوە، بۆ دەسەڵاتی سیاسی ئێستای هەرێمی کوردستان، لەبەر نەبونی ئەم خیتابە خەڵکی هەرێمی کوردستان ئاسان

نییە بەنیەتی ناو دڵیان بە بەدیلی ئەمڕۆی دەسەڵاتی سیاسیان بزانی، دەبێ خۆت بە پێی بەرنامەیەکی داڕێژراو، ڕەنگبداتەوە لەخیتابت، هەمو ئەندام و کادیر و خەڵك و جەماوەر بزانن، کە تۆ بڕیارت داوە بگەیتە دەسەڵات، خەڵك لەم پاشاگەردانییە رزگار بکەی، کاتێك ئەم خیتابەت نیە، بەتەمای ئەوەی نەبی تەنها بەناوی دینداری و تەقوا هەمو خەڵك بەدوات بکەوی، خەڵك بە سروشت سەرەتا لە ژیان دەگەڕێ، تەنها دواڕۆژ چارەسەری برینی قوڵی ژیانیان ناکات، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ژیان و ئەمنیەت و ئابوری و خۆشگوزەرانی تەواوی لە دەوڵەتی مەدینە بۆ خەڵك دابین کرد، بەم خیتابە بوە جێگەی موتمانە بۆ خەڵکی دیندارو ئاین و ئاینزاکانی تریش. خیتابمان شارستانیەت و ئاوەدانکردنەوەو بەختەوەری ژیانی مادی تێدا نیە، تەنها تەرکیز لەسەر دواڕۆژە، ئەمە بۆ توێژێك کاریگەری دەبێت، هەمو چین و توێژەکان ئومێدیان بەم خیتابە نییە، ئەگەر بڵێی خەڵك کەیفی خۆیەتی! ئەوا نابی بەنیازی پێشەنگی تەواوی کۆمەڵگا بیت، هەر لەم چوخزە تەسك و سنوردارە دەمینێتەوە.

بۆ نمونە: حیزبی ئیسلامی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ، چەند ساڵ هەمو سنوری هەڵەبجەو خورماڵ و ئەحمەداوەو سنوری شارەزوری بەدەستەوە بو، ڕۆژێك شەقامێکیان دروست نەکرد، پارکێیان ئاوەدان نەکردەوە، دارێکیان نەچاند، چەند بیرێکی ئاومان لێ نەدا، فەرمانگەیەکیان ئاوەدان نەکردەوە، قوتابخانەیەکی گشتییان نەکردەوە، هیچ گرنگییان بەبواری خزمەتگوزاری و بابەتەکانی پەیوەست بەژیان نەدا، خۆ دەکرا لەم سنورە جوانترین نمونەی خزمەتگوزارییان پێشکەش بەخەڵك و جەماوەر بکردبایە، لەدار چاندنەوە بگرە، تادەگاتە نەخۆشخانە و قوتابخانە و شوێنی گشتی، هەتا هەتایە دەبوە مێژوو بۆ حیزبی ئیسلامی، کە چەندە گرنگی بەژیانی هاوڵاتیان دەدات و لەخزمەتی ئاوەدانکردنەوەیە، تێڕوانینی خەڵکیش دەگۆڕا، دەگوترا حیزبی ئیسلامی هەر خەمی دین و ئەخلاقی خەڵکی نییە، بەڵکو خەمی ژیان و گوزەران و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتیشە، بەڵام بەداخەوە لەبەر ململانێ نێو خۆیی و تەفرەقە و نەبونی پەیامێکی ڕون ، خۆخەریك کردن بەبابەتە جوزئیاتەکان هیچ ئاسەوارێکیان لەم سنورە بەجێ نەهێشت مێژوو خەڵك و جەماوەر شاهێدی خزمەتگوزارییان بۆ بدات.

## چارەسەر کردنی لێڵی لە گەیاندنی پەیام

لێڵی و ناڕونییەك لەگەیاندنی پەیام هەیە، هەموو حیزبێکی سیاسی پەیامێکی هەڵگرتوە، بەم پەیامە دەتوانی ئاراستەی جەماوەر بکات بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی، بۆ ئەم مەبەستە دەبێ پەیام ڕون و ئاشکراو دیار بێ، بەداخەوە پەیامی ئێمە وەك حیزبی ئیسلامی لێڵ و ناڕونە، بەئاسانی جەماوەر تێی ناگات، دیراسات و لێکوڵینەوەی زانستی کۆمەڵناسی دەری خستوە جەماوەر پشتگیری هیچ ڕەوت و حیزبێکی سیاسی ناکات تەنها بە دوو مەرج نەبێ. یەکەم: جەماوەر دەبێ بەڕونی بزانێ ئامانج و هەدەفی حیزبەکە چیە؟ مەرچی دووەم: دەبێ حیزب گرنگی بەکێشە و مەشاکل و بابەتی خەڵك و جەماوەر بدات و گرفتەکانی بۆ چارەسەر بکات. ئامانجی حیزبی ئیسلامی دەبێ واقیعی و ڕون بن، لەمیسالیات و ناواقعی بون نەژین، خۆ بە بابەتە تیوریەکانی نێو حیزب خەریك نەکەن، گوتاری سیاسی ئاسان و سادە بێت و هەڵقوڵاوی نێو گرفتی جەماوەر بێت. لەگەڵ دەردو مەینەت و گرفتەکانی خەڵك بێتەوە، ئەو کات خەڵك و جەماوەر دەوری لێ دەدات و پشتگیری دەکات، بەخاوەنی خۆی دەزانێ، لەهەمان کاتدا خۆی لەهەندێ بابەتی ڕابردو بەدور بگرێ کە کێشەیەکی ڕابردوەو بۆتە بەشێك لە مێژوو پەیوەندی بەخەڵك و جەماوەر نیە. هەروەها دوور کەوتنەوە لەبابەتە مێژوییەکانی ڕویانداوەو بەکۆمەڵێك گرفت لەکتێبەکاندا ماونەتەوە، باسی ململانێیەکی قوڵە لەسەر هەندێ بابەت، هیچ خزمەت بەئێستا ناکات، تا لێی بێدەنگ بی ئەوەندە باشترە. دور کەوتنەوە لەم گوتارە مێژوییەی تەنها باسی کارو چالاکیە مێژووییەکانە، بەئالیەتی ئەمڕۆ چارەسەر و بەرنامە ڕێژی بۆ ئێستا و داهاتو دابڕێژرێ. تەبەنی کردنی گرفتەکانی ئەمڕۆی جەماوەر لەڕوی فکری و عەقیدەیی و سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ئیداری و خزمەتگوزارییەکان... هتد بکرێت ، بۆ هەر بابەتێك ئەگەر بەتیوریش بێت چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە.

## گرفتی چوارەم: لاوازی تێگەیشتن لە واقیع. (فهم الواقع).

بەرامبەر ناسی بنەمای سیاسەت کردنە، خودای گەورە یاسایەکی تۆکمەی بۆ داناوین، تا بەرامبەرەکانمان بناسین، ئینجا هەنگاوی سیاسی بنێین دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾[1].

دوای بەر فراوان بونی دەسەڵاتی ڕۆژئاوا لەجیهان لەڕوی سیاسی و ئابوری و سەربازیەوە، ڕوداوەکان یەك لەدوای یەك دێن و بە پەلە دەگۆڕدرێن، هەر ڕوداوێکیش کە ڕوەدات کاریگەری خۆی لەسەر ئەحزابی سیاسی دادەنێت، پێویست دەکات حیزب خوێندنەوەی بۆ بکات و باش لەواقیعەکە حاڵی بێت، تابزانی ڕوداوەکان بەسودی پڕۆژەکانی خۆی تەواو بکات و نەکەوێتە بەر شەپۆڵی سلبیاتەکانی، ئەمەش تەنها بەوە دەکرێت کە خوێندنەوەت بۆ واقیع ورد و زانستیانە بێت، ئەمەش لەلای حیزبە ئیسلامیەکان لاوازە، زۆر جار ڕوداوەکان ڕو دەدەن و تێدەپەڕن ئینجا حیزبە ئیسلامیەکان هەستی پێ دەکەن، کەواتە ناتوانن سود لە ڕوداوەکە ببینن، یان بەلای کەم نازانن چەندان سلبیاتی بەسەر حیزبەکەوە جێ دەهێڵێت. پڕۆژەی ئەمریکی بەسەرۆکایەتی دوناڵد تراپ ڕاگەیندرا بەناوی ئاڵوگۆری سەدە (صفقة القرن)، دەیان گاریکەری لەسەر ناوچەکە بەجێ دەهێڵی، لەبری دیراسە کردنی ئەم بابەتە کادیری باڵای ئیسلامی باسی سەلاوەت لێدان دەکات لەشاشەکانی تەلەفزیۆن، ڕوداوەکانی گۆڕینی دەسەڵات لەئەمریکاو ململانێی دەولی نێوان ئێران و ئەمریکا لە عێراق و ململانێی قوڵی نێو خۆی دو حیزبی دەسەلات، حاڵەتی ئیسلامی لەبری دیراسەکردنی ئەمانە چار چار خەریکی سولح و ئاشتەوایی بو بۆیان، چونکە نازانی کێ سودی پێ دەگەینێ ، کێ زەرەرە. ئەمانە تەنها ئاماژەیەکە بۆ بەرچاو ڕونی ئەگەر نا بەدەیان نمونەمان لایە کە ئێمە وەك پێویست لە واقیع نەگەیشتوین، تا واقیعیش وەکو خۆی نەخوێنیەوە ناتوانی ببی بەبراوە.

---

(١) سورەتی الأنعام: ٥٥.

چارەسەر:

**بو چارەسەری ئەم گرفتە پێویستمان بەم هەنگاوانە هەیە:**

چۆن لە (واقیع) تێبگەین ؟

**بە واتایەکی تر چۆن (واقیع) و ڕووداو و پێشهاتەکان بە ڕاست و دروستی بخویندرێتەوە و تێی بگەین، تێ بگەین لە (واقیع) ئێمە لە کوێین؟ بۆ خۆمان لە دەستدا؟ بۆ ئێستا لەم سەرگەردانیە ئەژین؟ بۆچی خەڵك موتمانەمان پێ ناکات؟ بۆچی نابینە پێشەنگ؟ بۆچی خەڵك دەنگمان ناداتێ؟ خەتای ئێمەیە، یان ئەوان؟ بۆچی ئوممەی ئیسلامی زۆر لە دواوەیە؟ بۆچی کاریسە و ڕووداوەکان ڕوو لە ئێمەیە و لەسەر ئێمەیە؟ بۆچی لەم پیلان و فێڵانەی دوژمن ناگەین؟ لەم سەردەمەی شۆرشی زانیاری و ئینتەرنێت هێشتا هەر لە دواوەین، زیاتر سەرگەردانین؟ هەریەك شیکارێکی سیاسی دەکات پێچەوانەی ئەوی تر؟ ئەم حاڵەتە بۆچی و لەبەر چی؟ لە پای چی؟ ئەمانە هەمووی پرسیارن و وەڵامیان پێویستە! ئەگەر باش حاڵی بین لە واقیعی ئێستا دا بەدڵنیاییەوە ئەم هەموو نەهامەتیەش لەسەرمان دووبارە نابێتەوە.**

لەکوێ دەست پێبکەین بۆ تێگەیشتن لە ( واقیع ) ؟

**دیارە هەر زانستێك و پیشەیەك، ئەساسیات و بنەما و قاعیدەی هەیە بۆ تێگەیشتن، بە تەئکید تێگەیشتن لە واقیع بێ ئەساس و بنەما نییە، سوپاس بۆ خودا قورئان ئاماژەی بەو کەسانە کردوە کە باش لە واقیع حاڵی دەبن، دەفەرموێت:** ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡ﴾[1].

**ئەم حاڵەتەش بێگومان جێبەجێ دەبێت لە هەموو سەردەمەکان، بۆیە لە هەموو سەردەم و کات و شوێنێك زانایان هەن لە (واقیع) تێدەگەن و شیکاری سیاسی**

---

(١) سورەتی النساء (٨٣).

وردیان هەیە، تێگەیشتن لە (واقیع) بەتایبەتی بۆ سیاسەتمەدار و چاکسازخواز دەبێ ئەم خاڵانەی تێدا بێت.

١- ڕۆشنبیری گشتی.

٢- پسپۆر لە زانستی تایبەت.

٣- هۆشیاری سیاسی.

٤- سوود وەرگرتن لە هەڵەکانی پێشوو.

٥- دووبارە نەکردنەوەی هەڵەکان.

٦- ئاگاداربوون لە پرۆسە هاوشێوەکانی خۆی.

٧- بەدواداچونێکی بەردەوامی هەواڵ و ڕووداوەکان.

٨- خوێندنەوە.

٩- (تەخمین) کردنی پێشهاتەکان.

١٠- (مومارەسەی فکری) سیاسی بەکردار.

## هەنگاوەکانی تێگەیشتن لە ( واقیع )

ئەم ڕووداو و ناخۆشیانەی بەسەر کارو پرۆژەی ئیسلامی دا دێت، زۆربەیان لە مێژوو بەسەر ئێمە دووبارە بۆتەوە. ئێستا دەکەوینەوە هەمان ڕووداوی پێشوو. چەند هەنگاوێکمان پێویستە تا جارێکی تر نەکەوینەوە هەمان هەڵەی پێشوو لەوانە:

**یەکەم:** دەبێت ئەم ڕووداوانەی پێشوو ڕوویانداوە، بەوردی بنوسرێتەوە ئامادە بکرێت .

**دووەم:** پەند و ئامۆژگاری لێوەربگیرێت، بەهەمان شێوە بخوێنرێتەوە.

**سییەم:** ئەگەر بە وردی (دیراسەی) چۆنیەتی تێگەیشتنمان بکەین لە (واقیع)، بۆمان دەردەکەوێت کاریگەری ڕاگەیاندن زۆرە لەسەر تێگەیشتنمان. کەمتر وایە بۆ خۆمان لێکۆڵینەوە و (دیراسەی) خۆمان هەبێ، نابێ تەنها پشت بە ڕاگەیاندنی بەرامبەر ببەستین.

**چوارەم:** هەر ڕاگەیاندنێك بە تایبەتی سیاسیەکان بەشێکی ڕاستیان شێواندووە، بەم شێوەیە خۆیان دەیانەوێ ئاڕاستەی دەکەن. مادام بەشێك لە تێگەیشتن لە (واقیع) وەستاوە لەسەر ڕاگەیاندن، دەبێت وردبین و لێکۆڵینەوە بکرێت ئینجا کاری خۆتی لەسەر بینا بکەی.

**پێنجەم:** خوێندنەوەی (واقیع) پێویستی بەوە هەیە لەگەڵ خەڵك بژی. گۆشەگیری، بە تەنها ژیان، بۆ خۆت ژیان، ناتوانێ حاڵی کۆمەڵگە بزانێ و تێبگەی.

دەڵێن پاشای فەرەنسا (ماری ئەنگوانت) پێش شۆڕشی فەرەنسی لە ژیانی (ڕەفاهیەت) و خۆشی دەژیا، لە جیهانی دەرەوە تەواو گۆشەگیر ببوو، هەندێك لە کرێکارەکان لە برسان سکیان دەگوشی، هاتنە لای گوتیان: برسیانە هەفتەیەکە نانمان نەخواردووە، چونکە لەگەڵ خەڵك نەدەژیا، ژیانی خۆی پڕ لە (ڕەفاهیەت) بوو، لە خشتەی مێشکیدا ئەوە نەبوو خەڵکانێك هەیە نان نییە بخوات، وەڵامی داوە وتی بۆچی (ڕێجیمی) دەکەن و نان ناخۆن هۆکاری چییە؟.

**شەشەم:** خوێندنەوەیەکی قوڵ، ئەمرۆ بەشێك لە موسڵمانان (واقیع) زۆر بەسادەیی دەخوێننەوە، بۆیە سەرەنجامێکی هەڵەمان بۆ دەردەکەوێت، خوێندنەوەی (واقیع) تێگەیشتن پێویستی بە زانیاری زۆر قوڵ هەیە، کۆمەڵگە یەك چین و توێژ نیە بەڵکو چەند توێژێکە، بۆ هەر توێژێك خوێندنەوەیەکی دەوێ، کۆمەڵگا بەگشتی لەچەند چین و توێژی جیاواز پێکهاتووە. لە دەزگا و حیزب و توێژەکان بەیەك خوێندنەوە بخوێنرێتەوە ئەوە هەڵەیە و لە (واقیع) نەگەیشتنە.

**حەوتەم:** چەند خوێندنەوەت بەهێزبێ، سیاسەت و کارکردنت ڕێکوپێك دەبێت، سەرەنجام زۆرجار وەك ئەوە نییە کە تۆ دەتەوێ، بۆیە دەبێ ئاگادار بیت هەڵە حاڵی نەبیت لەسەرەنجام.

**هەشتەم:** بەبێ ئاگاداربوون لە ڕووداوە هەرێمی و نێودەوڵەتیەکان ناتوانی بەهیچ شێوەیەك (واقیع) بخوێنیتەوە، تاوەکو لە سیاسەت و هەنگاو و ڕووداوەکانی نێودەوڵەتی و هەرێمی شارەزا بیت (واقیعت) باشتر بۆ دەخوێنرێتەوە، ئەمڕۆ دونیا

بۆتە گوندێك بەهۆی جیهانگەراییەوە، هەموو ڕووداوەكان كاریگەریان لەسەر یەكتر هەیە، خوێندنەوەی (واقیعیش) بۆ چارەسەرە، بەبێ ئاگاداری تێگەیشتنی دروست و تەواو لەسەر واقیع نایەتە بەرهەم.

**نویەم:** شارەزایی لە چەمك و زاراوەكانی سەردەم بە تایبەتی چەمك و زاراوەی سیاسی، یاسایی، ڕاگەیاندن، تێگەیشتن لەم چەمكانە بەشێكە لە تێگەیشتن لە (واقیع)، زۆر چەمك و زاراوە پەیدابووە، ڕۆژانە لە دەزگا ڕاگەیاندنەكان دەگوترێت، بەشێك لە موسڵمانان تائێستا هەوڵیان نەداوە لەم چەمكانە بگەن، بەبێ ئەمانە چۆن لە (واقیع) دەگەی بە تایبەتی مامۆستایانی ئایینی.

**دەیەم:** دەرچوون لە بازنەی زانستی (شەرعی). زانستی (شەرعی) لە بنەڕەتدا هەموو زانستەكان دەگرێتەوە، بەڵام لەم دواییەدا لە قوتابخانە و مزگەوتەكان زانستی (شەرعی) سنوردار كراوە، كورتكرایەوە بۆ چەند زانستێكی (فیقهی) سنوردار، بەمەش بەتەنها ناتوانی لە (واقیع) شارەزا بیت، بەڵكو زانستەكەت گۆشەگیر دەبێت لەم چەند زانیارییە تایبەتەی كە لە كتێبەكەدا هەیە، بۆیە دەبێت لەم بازنەیە دەربچیت تا (واقیع) بخوێنینەوە.

**یازدەهەم:** هەموو هەنگاوێك بە پیلان (مؤامرة) ئەزانرێت. كلتورێك هەیە بۆتە بەربەست لە ڕێی تێگەیشتنمان، پێمان وایە هەموو شتێك كە ڕوودەدات لەپێشدا نەخشەی بۆ كێشراوە، تۆ تێبگەی یان نا ئەوە سودێكی نییە! بۆیە پێویست بەخۆ سەرقاڵكردن ناكات، ئەوە كارەساتە موسڵمان وابیربكاتەوە، ڕاستە زۆر شت نەخشەی بۆ كێشراوە، بەڵام ئەوەی خودا دەیەوێ زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەی پیلان و نەخشەی بۆ داڕێژراوە لە سونەتی ژیان، بەردەوام هەوڵدەدات ڕاست و دروست لە بابەتەكان بگات تا ڕووبەڕووی بێتەوە .

**دوانزەم:** هەموو ڕووداوێك هات یەكسەر دەڵێین ئەوە (قیامەت) نزیك بۆتەوە، تازە تەواو دونیا كۆتایی دێت، بەم بەهانەوە وەك ئەوەی بمانەوێ لە شتەكان نەگەین، بۆ ئەوەی خۆمان ماندوو نەكەین و لە بەرپرسیاریەتی دوور بكەوینەوە. پێویست

ناکات خۆت ماندوو بکەی، تێگەیشتنی بۆچییە، ئەمە نیشانەی (قیامەتە) و کۆتایی دونیایە!. ڕاستە خودای گەورە لە قورئاندا ئاماژەی بە ڕۆژی دوایی داوە، پێغەمبەر (ﷺ) لە چەندین فەرموودەدا ڕوونی کردۆتەوە، بەڵام ئایەت و فەرموودەکان داوای ئەوە دەکەن تا باش لە (واقیع) بگەین، نەخشەڕێگا نەك تەنها بۆ دونیا بەڵکو بۆ ڕۆژی تێکچون و دوای مردنیش بکێشین، تێبگەین تا پێبگەین، ئەگەر ببینین بەیانی دونیا کۆتایی دێت، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (اذا قامت الساعة وفي يد احدكم فسيلة، فاستطاع ان يغرسها قبل ان تقوم الساعة فليغرسها)[1]، واتە: (ئەگەر ڕۆژی دوایی هات لە دەستی هەریەکێکتان نەمامێك هەبوو، ئەگەر توانی پێش ئەوەی دونیا تێکبچێت بیچێنی بابیچێنێت). ئەوە تێگەیشتنە لە (واقیع) و نەخشەڕێگایە بۆ داهاتوو.

## کۆسپ و تەگەرە و ڕێگرەکانی تێگەیشتن لە (واقیع)

بێگومان ئەم هەنگاوانە بەشێك لەم ڕێگرانە لادەدات بەڵام بەپێویستی دەزانم بە چەند خاڵێك باسی ڕێگری تێگەیشتن لە واقیع بکەین، بۆ ئەوەی خوێنەر بە ئاسانی ڕێگرەکان بناسێتەوە.

ئەوانەی لە کۆمەڵگە دەژین. چەند جۆرێکی سەرەکین:

**یەکەم:** جۆرێکیان گەیشتۆتە بێ ئومێدی، ئەمەیان نایەوێت لە (واقیع) تێبگات، شەو و ڕۆژ ئەم فەرموودانە دووبارە دەکاتەوە، (فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، ولوْ أَنْ تَعَضَّ بِأَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وأَنْتَ عَلى ذَلِكَ)[2]. واتە: (پشت لە هەموو دەستە و جماعەتەکان بکە، یان دەست بە ئەسلی دارەکە بگرە تا مردن دەتگاتێ تۆ هەروا بمێنەوە). ئەم جۆرە فەرموودەیە بەهەڵە وەسف دەکات و بۆ خۆی کردوویەتی بە بیانوو.

---

(١) بڕوانە : مسند الامام ئەحمەد ، ژمارە: (١٢٩٢٥) .

(٢) : بڕوانە: صحیحی ئیبن ماجە، ژمارە (٣٢٢٩).

**دووەم:** ئەم جۆرەیان پەیوەندی لەگەڵ دونیا بەهێزە، ئەمەیان زۆر حەزناکات لە زۆر بابەت تێبگات، تەنها ئەوانە نەبێت کە پەیوەندییان بە بەرژەوەندی ئەو هەیە، جارجاریش دەڵێت: (انا رب الابل وللبيت رب يحميه)، واتە: (من خاوەنی وشترم، بەیتیش خاوەنی خۆی هەیە بیپارێزێ).

**سێیەم:** جۆری سێیەم سەرسامە بە سەرکەوتن و هێزی شارستانیەتی ئەوروپا، ئەم جۆرە تووشی داڕووخانی دەروونی بووە، پێیوایە تازە دونیا کەوتۆتە دەستی ئەوروپا و مەحاڵە جارێکی تر ئەم شارستانیەتە بەهێزە بگەڕێتەوە دەستی موسڵمانان، بۆیە تێگەیشتن لە (واقیع) هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، با لەگەڵ بڕۆین باشترە خۆمان بەتەواوەتی (تەسلیمی) ئەوروپا بکەین.

**چوارەم:** هەست نەکردن بە بەرپرسیاریەتی، ئەم جۆرەیان ئەم هەموو ڕووداو و کارەسات و کوشتن و بڕین و لە ناوبردن و منداڵ و ژن و پیر کوشتنە لەناو موسڵمانان هیچ کاری تێناکات! هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات سۆزی ناجوڵێت، دڵی ڕاناچڵەکێ، چاوی ئەبڵەقە نابێ، ئەمەیان نایەوێ لە (واقیع) بگات.

**پێنجەم:** بەرژەوەندی تایبەتی، بەشێك لەوانەی نایانەوێ لە (واقیع) تێبگەن بەرژەوەندی تایبەتییە، کەسەکە بەرژەوەندی لەم سیستەمە گەندەڵە هەیە، سوودی ماددی لێ دەبینێت، پلەیەکی حیزبی، یان حکومی وەرگرتووە، ئەم جۆرەیان خۆی لە (واقیع) گێل دەکات، حەز ناکات تێبگات تەنها ئەوەندە نەبێت کە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی بپارێزێت .

**شەشەم:** هەڵاتن لە بەرامبەر ڕووبەڕووبونەوەی (واقیع)، ئەوانەی کە بەردەوام بەهانە دێننەوە و (واقیعێکی) کەوتوو بەپێشکەوتوو (وەصف) دەکەن، دەڵێن چ گرفتێکمان هەیە! لەوە باشتر چیمان دەوێ! لەوە زیاتر چی دەکرێت! (الحمدلله) موسڵمان زۆرن، نوێژخوێن، ڕۆژووگر زۆرن، ناوەندی لەبەر کردنی قورئانمان هەیە، ئەم هەمو مزگەوتە هەیە، کەناڵی تەلەفزیۆنیمان هەیە، ئەم دڵەراوکێیەی بۆچییە! ئەمەشیان زیاتر هەڵاتنە لە بەرامبەر (واقیع)، ناتوانێ ڕووبەڕووی (واقیع) ببێتەوە،

ئەگەر باس لە نەخۆش و ناخۆشی و هەژاری و ژێردەستەیی و دواکەوتنی موسڵمانان و لەناوچوون و زوڵم لێکردنیان بکەی، ئەڵێت: ئەمە زۆر لە وزە و توانای ئێمە زیاترە، پێویست ناکات بیری لێ بکەیتەوە. ئەمە تەنها بەوە دەکرێت یان (عیسا) (سڵاوی خوای گەورەی لەسەر بێ) بێتە خوارێ، یان (موحەممەد مەهدی) بێت، یان کەسێکی تر جگە لە ئێمە (مجدد) بێت، ئەگەرنا ئەمە لە توانای ئێمەدا نییە.

**حەوتەم:** خۆبەستانەوە و پەیوەست کردن بەیەك قوتابخانە و حیزب و (فکر) و (مەنهەج) و کەسایەتییەك. یەکێکی تر لە بەردەم تێگەیشتن لە (واقیع) خۆبەستانەوە و دەمارگیرییە بۆ بۆچوون و ڕای کەسێك، یان قوتابخانەیەك، ئەگەر کەسەکە، یان قوتابخانەکە ئاستی ئەوەندە بەرز نەبوو لە (واقیع) بگات، ئەوا وا لەخوارەوەی خۆی دەکات ئەوانیش بە چاوی ئەو سەیری (واقیع) بکەن. بۆیە بە هەڵە (واقیع) دەخوێنێتەوە، ئەمەش جۆرێکە لە خۆبەستانەوە و سنوردار کردنی زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری.

**هەشتەم:** خۆ بواردن لە ڕاستییەکان، خوێندنەوەی (واقیع) پێویستی بە بەدواداچون هەیە بۆ ڕووداوەکان تا ڕاستیەکانت بۆ دەرکەوێت، ئەوەی خۆببوێرێ بۆ ئەوەی لە بەرپرسیارەتی ڕابکات ناتوانێ لە (واقیع) تێبگات .

**نۆیەم:** ژینگە و شوێنی ژیان، ژینگە و ئەم چوارچێوەی مرۆڤ تیادا دەژێت ئەگەر دۆگما و چەقبەستوو بووبێ، ناتوانێ باش لەم ژینگەیە لە (واقیع) بگات. عەرەب دەڵێت: (مرۆڤ کوڕی ژینگەیە)، واتە ژینگەکە پێشکەوتوو ژیر و دانا بێت تاکەکە وا دەردەچێت .

**دەیەم:** دەستەبژێری بیرمەند و بانگخواز و زانا و دانا، ئەم جۆرەیان جێی ئومێدە، ڕزگارکاری میللەتە، بەردەوام لە هەوڵدایە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی کۆمەڵگە، بەڵام ئەمەش ڕێگرییان زۆر لە پێشە، بواریان بۆ نەڕەخساوە، تا ئەوەی لە بیریان دایە بیگەینن.

## گرفتی پێنجەم: هێنانەوەی پاساوی بەردەوام.

**پارەو دەسەڵات لەلای ئەوانە!؟ خەتای جولەکەیە!؟ ڕۆژئاوا نایەڵێ پێش بکەوین!؟ بۆیە نامانەوێ ڕەخنەمان لێ بگیری و بەخۆداچونەوە بکەین.**

**هەندێ وشەو ڕاوو بۆچون هەیە بۆتە وێردی سەر زوبان، بەردەوام دەگوترێتەوە، خۆی سەپاندوەو بەبێ لێکوڵینەوە قبوڵ کراوە، بۆتە ڕێگرێك لەبەردەم پێشکەوتنی پرۆژەو کاری ئیسلامی، ئەم جۆرە وشە و بەهانەیە بۆ ئەوانە باشە کەتوانای گۆڕانکاریان نیە، یان حەز بەگۆڕانکاری ناکەن، یان بەگوڕانکاری پێگەو و بەرژەوەندیان لەق دەبێت، یان بەم عوزرەیان پاڵ دەدەنەوە، وەڵامی ئاسان و سادە بۆ پرسیارەکان ئامادەیە، یان هەر بۆتە قەناعەت و بڕوای پێیەتی، بەهانەکەش ئەوەیە کاکە گۆڕانکاری چی؟ خەتای ئێمە نییە!!!، (پارەو دەسەڵات لەدەستی ئەوانە) یان (هەمو خەتای جولەکەیە)، (ڕۆژئاوا ئێمەی قبوڵ نییە)، بێگومان لەڕوێکەوە تەواوە، پارەو دەسەڵات لەلای ئەوانە، هەروەها جولەکە لەپشتی زۆربەی بابەتەکانە، بەڵام لەڕاستیدا بابەتەکە لەسەرەتا لەکوردستان وانەبو، خۆمان هۆکار بوین وای لێ بێ، پارەو دەسەڵات لەدەستی ئەوان بێ ، چۆن؟؟؟.**

## چـارەسـەر

**وەلام: ژیان ململانێیە، تا دونیا مابێ ئەم ململانێیە کۆتای نایێ، براوەش ئەوەیە دەست بەسوننەی ژیان و بونەوەر بگرێ و لێی لا نەدات، خودای گەورە لەبارەی کافران دەفەرموێت:﴿ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾[1]، واتە: ئەوان شەوو ڕۆژیان لێك داوەو خەریکی پەیداکردنی پارەو دەسەڵات و پیلانن، دەستیان کەوت بۆ؟ چونکە: [وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرثَ الدُّنيَا نُؤتِهِ مِنهَا][2]. لەبەرامبەردا بەئێمە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ**

---

(١) سورەتی سبأ: ٣٣.

(٢) سورەتی الشوری: ٢٠.

رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴾[١]. بەڵام ئێمە ئەم سوننەمان جێبەجێ نەکرد، شەوو ڕۆژمان لێك نەدا بۆ کار کردن، لەکاتی فەراغ کار بۆ ئیسلام دەکەین، یان دەیکەین بەڵام دەست بەسوننە و یاساکانی خودایی ناگرین، سەرکەوت و نابین، دونیاش بەرهەمی کارکردنی دەستی مرۆڤە﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾[٢]. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەجەزیرەی عەرەب پارەی لەدەست نەبو، دەسەڵاتیشی لەدەست نەبو، لەبەرامبەردا دەوڵەتی فارس و ڕۆم و بیزەنتی و ساسان و حەبەشەو ... هتد، هەبون، خاوەنی نەك پارە و دەسەڵات بەڵکو ئیمپراتۆر بون. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەی فەرمو چونکە پارە و دەسەڵات لەدەستی ئەوانە ئێمە پێش ناکەوین، بەڵکو پرۆژە و بەرنامە و دیدگا و قەزیەی دەست پێ کرد، شەو و ڕۆژی بۆ تەرخان کرد، لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر بو (صلی الله علیه وسلم)، پاڵپشت بو بەوەحی، ئینجا دەستی بەهەمو سوننە ڕەبانیەکان گرت، لەیەك شوین موسڵمانان توشی نەهامەتی بون و کافرەکان تێدا سەرکەوتن، لەڕوی دونیاییەوە، خودا فەرموی: (قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ).

دو حیزبی دەسەڵات لەکوردستان سەرەتا لە وڵاتان هاتنەوە، بەپێی هەندێك زانیاری تەنانەت سەرکردەکانیان جل و بەرگیشیان لە هەندێ سەرۆك عەشیرەت وەرگرتوە، واتە ئەوەندە لاوازو بێ پارەو دەسەڵات بون، هەنگاوی شەو و ڕۆژیان نا، تا چوار بابەتی ئەساسیان خستە ژێر دەستی خۆیان، بابەتی ئابوری، ئەمنی، سیاسی، دەسەڵات و حوکم. لەولاوە یەك هەڵدەستێتەوە دەڵێ ئاخر ئەوان جولەکەیان لەپشت بوو، دیارە ئەمەش پاساوێکی بێ بنەمایە، مالیزیای مەهاتیر هیچ پارە و دەسەڵاتی نەبو، بە پرۆژەیەکی درێژ خایەن بو بەخاوەنی مالیزیای پێشکەوتو، جولەکەش دژی بوو، عەدالەو تەنمیە لەتورکیا بانگراوندی ئیسلامی بوو، نە پارەو نە دەسەڵاتی لەدەست نەبو، ئێستا بەبەهێز ترین وڵات دادەنرێت لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، جولەکەش دژی بو. بێگومان بەندە دان بەوە دەنێم گرفت و بەربەستی دەرەکی زۆرن و ڕۆژئاوا

---

(١) سورەتی نوح: ٥.

(٢) سورەتی النجم: ٣٩.

نەخشە و پلانی هەیە نەهێڵێ بگەیتە دەسەڵات ، سەردەمی پێغەمبەریش نەخشەی دەرەکی بەهێز هەبو، کاتێك موسڵمانان لە جەنگی ئوحد سەرنەکەوتن هۆکارو بەر بەستی دەرەکی گەورە هەبو، بەڵام خودای گەورە لەقورئاندا دەست بەرەخنەی ناو خۆ دەکات و دەفەرمویێت:﴿ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾[1].

چەندان بەربەستی دەرەکی گەورە هەیە لە ڕێگایان، بەڵام خودای گەورە دەفەرمویێت: پێیان بڵێ هۆکارەکەی خۆتانن، خوتان مەبەستی کێیە؟ ئێمە؟ نەخێر! بەڵکو صەحابەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەم گلەیی و ڕەخنەیە لەکێ تۆمار دەکرێ، لەقورئان تا ڕۆژی دوایی دەخوێندرێتەوە، ئێمەش خۆمان و بۆچونەکانمان بە پیرۆز دەزانین، قبوڵی ڕەخنەیەك ناکەین، قبوڵی دانان بەهەڵەکانمان ناکەین، بۆیە دەیدەینە پاڵ بەرامبەر، تا بەئاسانی لێی دەرچین. بەردەوام پاساو بۆ شکستەکان دەهێنینەوە، هەمو شکستێك هۆکاری خۆی هەیە پاساو هێنانەوە بۆ هەموو شکستێك، تەنها بۆ ئەوەی خۆتی پێ رزگار بکەی و دان نەنێی بەشکستەکە، کارێکی زۆر ترسناکە و لەسەر حیسابی دین و دەعوەیە، دیارە هەمو دواکەوتن و شکستێك دو هۆکاری سەرەکی هەیە (دەرەکی و ناوەکی ) بەشیك لەو حیزبانە هۆکارە ناوەکییەکان چارەسەر ناکەن، بۆیە بەردەوام دەڵێن بەرامبەرکەمان بەهێزە و پارەی هەیە و دەسەڵات لەدەستی ئەوە..هتد، بەڵام هەمو هەنگاوە چاکسازیەکانی دونیا کە لەگەڵ بەرامبەر کراوە خەڵکانێك بون، نەخاوەن پارەو نەخاوەن دەسەڵات !!!ئەگەر دەسەڵات خۆی چاکسازی بکات ئێوە زیادن، هەروەها کەس خۆی بەهۆکاری شکستەکە نازانێ دەیەوێ بیخاتە سەر ئەوانی ترو لەخۆی دوور بخاتەوە، خۆی وانیشان دەدات کە ئەو هۆکار نییە لەم شکست و دواکەوتوییە بەڵکو ئەوانی ترن، ئەمە تەنها بۆ خۆ دەرباز کردنە، لە بەخۆدا چونەوە و دان نەنان بەوەی کەلەدواوەیە.

---

(١) سورةتى ال عمران (١٦٥)..

گرفتی شەشەم: گرنگی نەدان بە ئابوری بەهێز و زەم کردنی دونیاداری (دونیا هیچ بەهایەکی نییە)؟، بۆتە هۆکار ٢٩ ساڵە ئابوری و دارایمان لەبەردەستدا نییە!!!.

(دونیا هیچ نییە) بۆتە وتاری زۆربەی سەرکردەی سیاسی ئیسلامی و مامۆستایانی ئاینی و بەشێك لە بانگخوازان ئەوانەی لەڕیزی کاری ئیسلامین، ئەم تێڕوانینە ناواقیعیە چەندە گرفتی بۆ پێشەنگ بون دروست کردوە، چەندە زەرەری لە هەستانەوە و نەهزە داوە. ناسینی هەر ئاین و پیردۆزێك عیبارەتە لە خیتابی سیاسەتمەدارو بیرمەندو بانگخوازەکانی، بەهێزترین ئایین لەسەر ڕوی زەوی کە بۆ ژیان تەواو و گونجاو بێ، ژیانی ئاسودەو پێشکەوتن پێشکەش بکات، لەگەڵ فیترەتی مرۆڤەکان هاوڕابێت ئیسلامە، بەتایبەتی تێڕوانینی بۆ ژیان و مرۆڤ و بونەوەر.

(ژیانی دونیا هیچ نییە) مانای چیە؟ ژیانی دونیا پێك دێت لە ئابوری و کۆمەڵایەتی و خۆشگوزەرانی و کۆمەڵناسی و سیاسی و هەموو ئەوانەی کە مرۆڤ ئاواتی پێ دەخوازێ، پێی دەڵێن ژیانی دونیا، ئیدارە دانی دەوڵەت، واتە ڕێکخستنی ژیانی تاکەکان لە دونیا، کەچی ڕۆژانە سیاسەتمەدار و مامۆستایانی ئایینی لەکۆڕ و وتار و موحازەرە و سیمینارەکانیان بۆ ئەندامانیان یان لە شوێنی گشتی، بەردەوام زەمی ژیانی دونیا دەکەن کە هیچ نییە! ئەمەش کاریگەریەکی زۆر خراپی لەسەر پاشەکشەی کاری ئیسلامی دروست کردوە، وای کردوە کە ئەندامان و خەڵکی گوێ گر ڕقی لەماڵ و سامان و ئابوری و خۆشیەکان ببێتەوە، هەروەها خەڵك وا تێدەگات کە کاری ئیسلامی دژی خۆشیەکانی دونیایە، هەر بڕەو بە فەقیری و هەژاری و نەداری دەدات، بێگومان ئەمەش پێچەوانەی قورئان و سونەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم )، لەهیچ شوێنێك لەقورئان و سونەتدا نەهاتوە مەدحی هەژاری کرابێ، بەڵکو مەدحی خۆڕاگری لەسەر هەژاری کراوە، هەروەها لەهیچ شوینێکی قورئان زەمی ژیانی دونیای نەکردوە، لەهەر شوێنێکیش زەمی کردبێ لەبەر دوو هۆکار بوە، یەکەم: دونیا لەبەرامبەر قیامەت هیچ نییە، یان خۆشیەکانی بەهەشت نەبڕاوەن و زۆر باشترن چونکە نابڕێنەوە.

دووەم: یان ئەوەتە وەسفی حەقیقەتی دونیای کردوە، تا وەك خۆی هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەی بەسەر قیامەتدا هەڵینەبژێری، یان پشت لەقیامەت بکەی تەنها دونیات بوێ. زۆربەی خیتابەکان کە باسی دونیایە ڕو لەکافرانن، نەك لەموسڵمانان، خودا هەڕەشە لەوانە دەکات کە خوشی و جوانیەکانی دونیا لەسەر خەڵك حەرام دەکەن، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾[1].

## ٣٠ ساڵە ئابوریەکی سەربەخۆمان بینا نەکرد :

بۆ ماوەی (٢٩ - ٣٠ ) ساڵە ئێمە بەشێك لەکارو چالاکیەکانمان لەسەر خێرخوازی بەڕێوە دەبەین، لەسەر پێی خۆمان نەوەستاوین، پڕۆژەیەکی سەرکەوتوی ئابوریمان بینا نەکردوە، کارمان لەسەر کۆمەڵێك کەسی ئابوری ناس و بازرگان نەکردوە، تا داراییەکی سەربەخۆ بۆ کاری ئیسلامی دەستە بەر بکەین، هیچ کارێکی دونیا سەرکەوتو نابێ بەبێ دارایی سەربەخۆ و بەهێز، چاومان یان لەدەسەڵات بوە، یان لەخەڵکی خێر خواز، کاری ئیسلامیش (٢٩) ساڵ بەخێرخوازی بەڕێوە ناچێ، لەهەر یەکێکیش بپرسی دەڵی جا چی بکەین؟ پارەو ماڵ لەدەستی دەسەڵاتە؟ ئەم پاساوە وەك پاساوەکانی تر بێ بنەمایە، هەڵاتنە لەکار کردن بۆ ئابوری و دارایی سەربەخۆ، ڕۆژانێك بو کومرگی هەندێك لەسنورەکان لەبەردەست بو، بیر لەوە نەکرایەوە بازرگانیەکی بەهێز، یان پڕۆژەیەکی درێژخایەنی ئابوری پێ دابنێین، بەداخەوە لەناو ڕابوون خەڵکانێك هەبون بەواستەی ڕابوون بازرگانیان کرد، ئێستا خاوەن سەروەتێکی یەکجار زۆرن، دەبێ بپرسین بۆ تاکێك لەناو ڕابوون توانی خۆی دەوڵەمەند بکات و بازرگانی بکات، بەڵام حیزبێك نەی توانی لەسەر پێی خۆی بوەستێ، دوای (٣٠) ساڵ لەکار کردن هەر چاوی لە دەسەڵات و لە خێرخوازان بێ، هۆکارەکەی ئەوەیە، لەبەر گرنگی نەدان بەم بەشە گرنگە ئابوریە، خەت خەتۆکی، بیر نەکردنەوە لەداهاتوو، موتمانە نەبون، لێك خۆیندن،

---

(١) سورەتی الاعراف: ٣٢.

نەبونی نەخشەی ستراتیجی ئابوری، نەبونی پسپۆری. خیتابی دونیا هیچ نییە تەنها دوارۆژ ئەم داهاتویە بۆ دیاری کردوین.

## چـارەسـەر

قورئان سێ بنەمای ئەساسی داناوە بۆ گرنگی دان بە ئاوەدانکردنەوە، کەکاری سەرەکی حیزبی ئیسلامیە، ئەمەش بەبێ ئابوری ناکرێ : مەبدەئی جێنشین(مبدء الاستخلاف)، مەبدەئی ڕام کردن (مبدء التسخیر)، مەبدەئی ئاوەدانکردنەوە (مبدء الاعمار) ، دەبێ سەرکردەی سیاسی بەم خیتابە بەهێزانە ئەندامانی لەسەر پەروەردە بکات، واز لە خیتابی عاتفی بهێنی، خیتابێکی واقیعی هەڵێنجراو لە قورئان و سونەت هەڵبژێرێ. دەوڵەتی ئیسلامی یەکەم داهێنەر بو لەدانانی (بیت المال) و چۆنیەتی داهات و سەرف کردن و کۆکردنەوەی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یاسا و بنەماکانی دانا، فەرموی: (التَّاجِرُ الصَّدُوقُ الأَمِينُ مَعَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ)[١] پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەتەنها بۆ ماڵی خۆی قوتی ساڵێکی داناوە: (کان ﷺ یدخر لأهله قوت سنة)[٢]. عمری کوڕی خەتاب ئابوری و دارایی دەوڵەتی ڕێك خست، تا مێژوی ئیسلامی مابو بەردەوام بوو، هیچ سیستەمێك لەپێشدا نەی بوە.

**خیتابی (دونیا هیچ نیە) چەندان زەرەری هەیە لەوانە:**

**١- موسڵمانان پشت لەدونیا دەکەن و هەر لەبازنەی هەژاری دەمێنینەوە، دوایی چاویان لەڕۆژئاوایە بەخێویان کات.**

**٢- گوێگر بەتایبەتی گەنج وادەزانێ کە ئیسلام تەنها ڕوت و ڕەجاڵی و برسیەتیە، لێی هەڵدێت. دونیا هیچ نییە پێچەوانەی فەرمانی خودایە کە ئاوەدانکردنەوەی بەمروڤ سپاردوە.** ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾[٣].

---

(١) بڕوانە: سونەنی الترمزی، ژمارە (١٢٠٩).

(٢) بڕوانە: فتح الباری شرح صحیح البخاری، ژمارە (٥٠٤٢).

(٣) سورەتی هود: ٦١.

٣- دونیا هیچ نییە پیچەوانەی فیترەتی مروڤە، مروڤ ئەوانەی لەدونیایە بەفیترەت خۆشی دەوێ.

٤- ئەگەر هەر دینێك رێی لەفیترەت بگرێ تێكگیران دروست دەبێ، هاوسەنگی تێك دەچێ ئەمەش لەئیسلام نییە.

٥- ئیسلام بۆ هەمو دونیایە، ئەگەر ئابوریەکی بەهێزت نەبی، چۆن دەتوانی دونیا بەڕێوە ببەی.

٦- سەرکردەی سیاسی و مامۆستای ئایینی دەتوانێ ئەوەی دەیڵێ بەخۆی واز لە دونیا و خوشیەکان بهێنێ؟ ئەگەر وانەکا دوای کەس موتمانەی پێ ناکات.

٧- ڕۆژئاوا بەئابوری توانیویەتی دونیا بەڕێوە ببات، فکری خوار و لاری خۆی بەسەر هەمو دونیا بسەپێنی.

٨- خەڵك واز لەکارو کاسبی دەهێنێ دەڵێت مادام دونیا هیچ نییە بۆ کار بکەم! هەمو گورەپانەکە بۆ بەرامبەرەکان جێ دەهێڵێ.

٩- ئەمەش وای کردوە چەند دەوڵەمەندێکی زۆر بەژمارە کەمیان هەبێ، بۆ تەواوی پڕۆژەکان دەگەڕێنەوە لای ئەوان، خۆ هیچ پڕۆژەیەك بەبێ ماڵ و سامان ناڕواتە ڕێوە.

١٠- بەشێك لەسەرکردە سیاسیەکان خانوی (٦٠٠) مەتری، لە ڕاقی ترین شوێنی شار، کوڕ و کچیان لەبەرزترین قوتابخانەی ئەهلی دەخوێنن، تازەترین مۆدێلی سەیارەیان هەیە، چۆن خەڵك موتمانە دەکات تۆ پێی بڵێی دونیا هیچ نییە. لەگەڵ دەیان زەرەری تر کە لەبەر درێژ بونەوە کورتم کردۆتەوە.

بۆ چارەسەر دەبێ بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سونەت و واقیع.

١- قورئان زۆرترین پانتایی بۆ ئابوری و دارایی تاك و دەوڵەت دیاری کردوە، یاسای: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[1].

---

(١) سورەتی البقرة: ٢٠١.

٢- چوار یاسای هاوسەنگی بۆ دونیاداری داناوە، دەفەرموێت: ﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾(١).

٣- هەڕەشەی توند دەکات لەوانەی دەیانەوی بەناویٚ زوهد و دونیا نەویستی، خەڵك بیٚ بەش بکەن لەخۆشی و جوانی و پاکی و لەزەتەکانی دونیا، لەکاتێکدا هەمو لەزەت و جوانییەکانی بۆ بەندەکانی دروست کردوە: ﴿ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةً يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾(٢).

٤- ماڵ و منداڵ و جوانییەکانی دونیای بەجوانکاری و زینە وەسف کردوە، دەفەرموێت ئەوان، جوانکاری دونیان، نەی فەرموە خراپە: ﴿ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، دواتر دەفەرموێت دوارۆژ و ئەوانەی لە پێش خۆت دەی نێری خێر تر و چاکترە، واتە دونیاداریش خێرە و چاکە بە حەڵاڵ، بەڵام دوارِۆژ زۆر باشترە. ﴿ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴾(٣).

٥- کاتێك خۆشیەکانی دونیا دەژمێری لە ئافرەت، منداڵ، زێڕ و زیو، سەیارە و سوارچاکی، مەڕو ماڵات، گیاندار و باغ و باغات کۆی دەکاتەوە، دەفەرموێت: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِ ﴾، ئینجا دەفەرموێت ئەوانە خۆشی و لەزەتەکانی دونیان ﴿ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾. ئەو خۆشیانەی مرۆڤ لە دونیادا بەحەڵاڵی لەزەتیان لیٚ وەردەگریٚ، ئەوانەن کە لەم ئایەتەدا باسکراون، دواتر دەفەرموێت لەوانەش خۆشتر لەلای منە: ﴿ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ﴾. زەمی دونیای نەکردوە فەرمویەتی زینە و جوانییە، بەڵام پێتان بڵێم لەوەش خێرتر و باشتر،

---

(١) سورەتی القصص: ٧٧.

(٢) سورەتی الاعراف: ٣٢.

(٣) سورەتی الکهف ٤٦.

واتە ئەمانە چاك و باشن بەڵام باشتر لەوانەش هەیە: ﴿قُلۡ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۖ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾[1].

٦- بە فیترەت مرۆڤ ماڵی خۆش دەوێ: ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا﴾[2]. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای دەوڵەمەندی کردوە و پەنای بەخوا گرتوە لە فەقیری: وعَن ابنِ مسْعُودٍ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِي أَسْأَلُكَ الهُدَى، وَالتُّقَى، وَالعفَافَ، والغنَى)[3]. واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرمو: ئەی خودایە داوای هیدایەت و تەقواو داوێنپاکی و دەوڵەمەندیت لێ دەکەم).

٧- (أن فقراء المهاجرين أتَوْا رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) فقالوا: ذهب أهل الدثور بالدرجات العلى والنعيم المقيم).[4]. واتە: ئەبو هرەیرە دەفەرموێت: هەژارە موهاجیرەکان هاتنە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتیان: خاوەن پارە و ماڵ و دەوڵەمەندەکان، بەهۆکاری پارە و ماڵەکەیان پلەی گەورەیان بەدەست هێناوە و لە نیعەمەتی بەهەشتدا جێگیر بون.

٨- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (اليد العليا خير من اليد السفلى....)[5]. واتە: دەستی بەخشەر باشترە لەدەستی وەرگر.

٩- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (لا حسد إلا في اثنتين: رجل آتاه الله مالا فسلط على هلكته في الحق، ...")[6]. واتە: خۆزگە خواستن تەنها لە دوو

---

(١) سورةتی ال عمران: ١٥.

(٢) سورەتی الفجر: ٢٠.

(٣) بڕوانە: سنن ابن ماجه ژمارە (٣١٠٥).

(٤) بڕوانە: صحيح مسلم، ژمارە (٥٩٥) .

(٥) بڕوانە: صحيح بخاری، ژمارە (١٤٢٩) ومسلم، ژمارە (١٠٣٣).

(٦) بڕوانە: صحيح بخاری، ژمارە (٧٣١٦).

حاڵەت دروستە، یەکیان پیاوێکە خودا ماڵی داوەتێ و لە خێرو چاکە و ڕێگای خودا و حەق سەرفی دەکات.

١٠- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پسپۆڕی ئابوری بوە و بازرگانی کردوە، نەفەقەی (١٠) ماڵ و خێزانی خۆی داوە، نەفەقەی منداڵەکانی داوە، دیاری بۆ مەلیك و کاربەدەستان ناردوە، دیاری مەلیکەکان دەبێ گرانبەها بێ، سەرۆکی وڵات بوە، یارمەتی هەژار و فەقیرانی داوە، لەبری قەرزدارەکان قەرزی داوەتەوە: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُ أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ مَا مِنْ مُؤْمِن إلا وَأَنَا أَوْلَى بِهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: {النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ}. فَأَيُّمَا مُؤْمِن مَاتَ وَتَرَكَ مَالاً فَلْيَرِثْهُ عَصَبَتُهُ مَنْ كَانُوا، وَمَنْ تَرَكَ دَيْناً أَوْ ضَيَاعاً فَلْيَأْتِنِي، فَأَنَا مَوْلاهُ)[1]. واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموی: هیچ ئیماندارێك نییە ئیلا من بۆی باشترم لەگیانی خۆی لە دونیا و دواڕۆژ، بخوێننەوە ئایەتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نزیکترە بەئیمانداران لەخودی خۆیان)، هەر ئیماندارێك وەفاتی کرد، میراتی بەجێ هێشت، با بۆ میراتگرەکانی بێت، ئەوەی قەرزدار بو، یان منداڵی لەدوا بەجێ مابوو، بابێتە لای من ، من بۆی دەدەمەوە.

کەواتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر گرنگی بە بازرگانی و دارایی داوە. ئەم بابەتانە زۆر گرنگی پێ بدرێت و بکرێتە خیتابێکی بەردەوام، تا ڕۆشەنبیری ماڵ و سامان و دەوڵەمەندی لە نێو خەڵکی موسڵمان بڵاو دەبێتەوە، گرنگی بە ماڵ و سامان و دارایی و ئابوری دەدرێت، وتاری دونیا هیچ نییە! بەپێوەری قورئان و سونەتی سەحیح تەعدیل بکرێت و ڕاست بکرێتەوە. ئێمە بانگەشەی ئەوە دەکەین کە ئیسلام هاتوە بۆ ئیدارە دانی هەمو ژیان، ئیدارە دانیش بەبێ ئابوری و داراییەکی زۆر نەبێ ناکرێ.

ئەمریکا جیهان بەڕیوە دەبات، ئابوری لە هەمو دونیا بەهێز ترە، هەر بەم ئابوریەش توانیویەتی هەیمەنە بەسەر جیهان دا بکات، کۆمپانیا زەبەلاحەکانی وەك ئەمازۆن، سەروەتی دەگاتە (٨٨٩,٢٩ ملیار دۆلار ). ئەپل (٦٣٢ ملیار دۆلار). و ألفابت»

---

(١) بڕوانە: صحیح بخاری، ژمارە (٢٣٩٩).

دایکی کۆمپانیای کوکڵە (٨٤٥) ملیار دولار. و مایکرۆسفت (٨١٥ ملیار دولار ) و ..هتد سەرمایەیان ترلیۆنات دۆلارە، ئەمریکا خاوەنداریەتی دەکات، بەم ئابوریە ڕاگەیاندن و سەربازی و دامەزراوە یاساییەکانی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆی، ئێمە نوسینگە و بارەگایەکی خۆمان پێ بەڕێوە ناچێ، بەتەمای دەوڵەتدارین، دەوڵەتی ئەوروپی زۆربەیان لەکاتی نەهزە و هەستانەوەیان پشتیان بە ئەمریکا بەستاوە، ئەمریکا یارمەتی داون، ئێستا ناتوانن لەبەرامبەری ڕاوەستن، سین بە توانا ئابوری و داراییەکەیەوە توانیویەتی خۆی بسەپێنێ و ترسی لەسەر وڵاتان دروست کردوە.

## گرفتی حەوتەم: تەفرەقە و خەت خەتۆکێ و تەکەتول و ململانێی ناوخۆیی.

هێزی هەمو گروپ و دەستەو حیزب و دەوڵەتێك لە بەهێزی مەرکەزیەت و یەکڕیزی دایە، بەداخەوە لەگەڵ سەرەتاکانی کاری ئیسلامی لەکوردستان خەت خەتۆکێش سەری هەڵدا، بوە دەردێکی کوشندە، تا ئێستاش هەر چارەسەر نەکرا، لە گوتار و سیمنار و کۆڕەکان زۆر قسە لەسەر ئایەتی: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ﴾[1]. و یەکڕیزی و یەکدەنگی دەکرێتەوە، لەنوسراوەکانی سەرکردە سیاسیەکان بەردەوام تەرکیز لەسەر برایەتی و تەبایی و یەکڕیزی دەکرێت، بەڵام هەر مەرەکەبی سەر کاغەزە، ئەوەی دەینوسی لەپێشدا بەخۆی خەریکی ئەو خەتانەیە کە بۆخوی پشتیان دەگری، یارمەتیان دەدات، دەیانهێنێتە پێشەوە، بەرزیان دەکاتەوە. هەر دەستەو حیزب و حکومەت و دەوڵەتێك کێشەی ناوخۆو خەت خەتۆکیێ تێدا بێت ناتوانی بەهێز بێ و بڵاو بێتەوە. عبدالملك ی کوڕی مەڕوان کاتێك هاتە سەر حوکم، دەوڵەتی ئیسلامی پەرتەوازە و پارچە پارچە بو، ململانێی ناوخۆیی زۆری تێدا بو، نەی توانی بەرەو پێشی ببات، فتوحات دەست پێ بکات بۆ فراوان بونی دەسەڵات و حوکمی ئیسلامی. خۆی لە شام حوکمی دەکرد ، مصعب ی کوری زوبێر لە کوفە، موهلبی کوڕی سفره لە خوراسان، عبداللەی کوڕی زوبیر لە مەککەی ، دەسەڵاتدار بون، عبدالرحمن کوڕی ئەشعەس لە لایەك، هەروەها خەواریجەکان لە لایەك و عەلەویەکان

---

(١) سورەتی آل عمران: ١٠٣.

له لایه‌كی تر، حوكمیان ده‌كرد، ئه‌م پارچه پارچه‌یییه‌ی ده‌وڵه‌تی ئیسلامی نه‌ی هێشت ده‌سه‌ڵاتی فراون بێت، تا ئه‌م ململانێ ناوخۆ و پارچه پارچه‌یییه‌ی یه‌كلایی كرده‌وه، دایه ده‌ستی ولیدی كوڕی، پێی گوت ئاگادار به، (وإياكم والفرقة والخلاف فبهما هلك الأولون، وذل ذوو العزة المعظمون)[١]، واته: ئاگاداری پارچه پارچه‌بون و ته‌فرقه و ململانێی ناوخۆ به، پێشینان به‌مه له‌ناو چون و خاوه‌ن ده‌سه‌ڵات و به‌عیزه‌ته‌كانی زه‌لیل كردوه، ئینجا بزانه ده‌وڵه‌تێكی به‌هێزو یه‌ك پارچه و یه‌ك ڕیزم داوه‌ته ده‌ستی تۆ، ده‌ست به‌فتوحات بكه‌و به‌ره‌و جیهان هه‌نگاو بنێ. دواتر ولیدی كوڕی عبدالملك ئیسلامی گه‌یانده ئه‌وپه‌ڕی دونیا، له‌سنوری جه‌نگی ڕۆم سه‌ركرده مه‌سلمه‌ی كوڕی عبدالملك گه‌یشته عه‌موریه و هرقڵه. موسی كوڕی نوسیر له‌سنوری ئه‌فریقیا حوكمی ئیسلامی گه‌یاندن هه‌مو مه‌غریبی عه‌ره‌بی. تارقی كوڕی زیاد ده‌وڵه‌تی ئیسلامی گه‌یانده ئه‌نده‌لوس، سه‌ركرده قوتیبه كوڕی موسلمی باهیلی له سنوری به‌ره‌ی ڕۆژهه‌ڵات ته‌واوی ڕۆژهه‌لاتی ڕزگار كرد تا گه‌یشته سنوری سین، محمدی كوڕی قاسمی سه‌قه‌فی بیلادی سندی ڕزگار كرد، ده‌وڵه‌تی ئیسلامی گه‌یانده ئه‌وپه‌ڕی دونیا، دواتر سولیمان ی كوڕی عبدالملك ده‌سه‌ڵاتی گرته ده‌ست، ئه‌ویش جورجان و ته‌به‌رستانی فه‌تح كرد و قوسته‌نتینیه‌ی گه‌مارۆدا، ئه‌م ده‌وڵه‌ته به‌وه ده‌ناسرێته‌وه كه زۆرترین و گه‌وره‌ترین فتوحاتی تێدا كرا، ئاوه‌دانی و خۆشگوزه‌رانی به‌رپا كرد، پاره و سكه‌ی خۆی دروست كرد، له‌هه‌موی گرنگ تر مه‌ركه‌زیه‌تی به‌هێز كرد، هیچ جۆره ململانێیه‌كی نه‌هێشت، ململانێی ناوخۆی تێدا نه‌ما. هه‌ندێ له زانا و مێژونوسان به سه‌رده‌می زێڕینی ناو ده‌به‌ن[٢]. ئێمه‌ی ئیسلامی له (١٩٩١) وه گیرمان خواردوه به ده‌ست ململانی ناوخۆیه‌كان و خه‌ت خه‌تۆكی!!!، ئێستا زۆر قوڵتر بۆته‌وه، وای لێ هاتوه گۆنگره‌ش چاره‌سه‌ری ململانێكان نه‌كات و قوڵتریان بكاته‌وه، له‌پێشدا هه‌مو خه‌ت و ململانێكان خه‌ته‌كانیان ڕێك ده‌خه‌ن و كه ده‌چنه گۆنگره هه‌مو شتێك بڕاوه‌ته‌وه و خه‌ته‌كان مسۆگه‌ر كراون، ئینجا ده‌چنه ناو گۆنگره بۆیه هیچ له‌وه‌زعه‌كه

---

(١) بڕوانه: الدولة الأموية. الشيخ محمد الخضري. دار المعرفة. ط:١٩٩٧ ص:٣٥٩.

(٢) بڕوانه: الدولة الأموية. الشيخ محمد الخضري. دار المعرفة. ط:١٩٩٧ ص:٣٥٩.

ناگۆڕێ، بەم ململانێ و پارچە پارچەیی و سەنگەر لێك گرتنە چۆن دەتوانین هەنگاو بۆ پێشەوە باوێین، لەبەر ململانێی ناوخۆ ناتوانین فریای کاری دەرەوەمان بکەوین، بزانین چۆن سیاسەت بکەین و چۆن کاری دەعوە بەرەو پێش ببەین، ئەگەر دەرد و گرفتەکانمان لەناو خۆمان بیت.

هەر لەم تەفرەقە و خەت خەتۆکێیە گرفتێکی تر سەر هەڵدەدات، ئەویش گرفتی دیاردەی بەبنەماڵەکردنی حیزب و بەخزم خزمانێ کردنە، دیارە ئەم دەردە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامی مێژوەکی دوور و درێژی هەیە و تازە نیە، کاریگەری خراپی لە دوای خۆی بەجێ هێشتوە، زەرەری زۆری لەپرۆسەی سیاسی و کاری ئیسلامی داوە، جگە لەوەی لادانە لە بنەماکانی شەریعەت، بەپێوەری ئەمڕۆی دیموکراسیش هەر دژە، ئەم دیاردەیە هاتۆتە ناو حیزبە ئیسلامیەکانیش بەتایبەتی لەکوردستان، هەوڵی ئەوە دراوە کەسی یەکەم شوێنی خۆی بەجێ نەهێڵێ، تەنها بۆ کوڕو برا و برازا و ئامۆزا و کەسە نزیکەکانی ناو بنەماڵە، یان ئەو کەسانەی کەبەخۆی کردویەتیە ڕۆبۆتو لەدەرەوەش بێت هەر بە بڕیاری ئەو دەڕوات، لە نێو حیزب و ئۆرگانەکانی حیزب هەر بڕیارێك بدرێت، کوتلە و کوتلەکاری و بیتانە تایبەتەکە دەور دەبینی، بەو ئاراستەی دا دەبات کە خۆیان دەیانەوێت، ئەم گرفتەش دەردێکی کوشندەیە بۆ کاری ئیسلامی.

چارەسەر :

هۆکاری سەرەکی دروست بونی ململانێی ناو حیزب دەگەڕێتەوە بۆ سەرکردە و کەسی یەکەم، کەسی یەکەم بە هیچ لایەك دا نەکەوت و هەنگاوی هەڵەی نەنا، پشتی خەت خەتۆکێ نەگرت، کەس ناتوانێ دروستی بکات، دروستیش ببی سەرکەوتو نابی شکست دەهێنی، سەرکردەکان زۆر جار لەبەر مانەوەی خۆیان، یان لەبەر لاوازی، یان لەبەر بێ ئاگایی لە ئیدارەدان بەلایەك دادەکەوێت و دەبێتە خەتێك، گرفتەکە قوڵتر دەکاتەوە، یان عاتیفە بەسەری دا زاڵە، یان لەکاتی گرفتە ناوخۆییەکان ناتوانی حوکمی یەك لایەنە بدات، گرفەکە بە عەدالەت یەکلا بکاتەوە. هۆکارێکی

تری ململانێ پەرژەوەندی خوازییە لەشوێنی مەبدەئو ئامانج، بەرژەوەندی خوازەکان تەنها ئامانجیان پاراستنی بەرژەوەندی خۆیانە ، گرنگ نییە حیزب چی لێ دێ، کاروانی بانگەواز و سیاسەت بەرەو کێ دەڕوات، کام لاو بەرە بەرژەوەندیەکانی بپاریزن بەرگری لەم خەتە دەکات، خاڵێکی تر هۆکارە ئەویش لاوازی هەندێ ئەندام، هیچ توانایەکی فکری و سیاسی و دبلۆماسیان نییە، بۆ گەیشتن بەپلە و پۆست، بۆ ئیمتیازات پەنا دەبەنە بەر خەتێکی سەرەوە، تا زوو گەورە بن و پلە پۆست و مەکانەتیان پێ بدرێت، فکری دەرویێش لە هەمو کات و زەمانێك نەخۆشیەکی کوشندە بوە، ئەمەش هۆکارێکی ترە بۆ خەت خەتۆکێ. ئەگەر بتەوی ئەم دیاردەیە نەهێڵی دەبێ هەوڵی سەرکردەییێکی بەهێز بدەی، عاتیفە کاری لێ نەکات، بڕیارەکان بە دەستە جەمعی یەکلایی بکەنەوە، پۆست و پلە بەپێی کەفائە دیاری بکرێت، هیچ جۆرە ڕێکەوتنێك پێش کۆنگرە قبوڵ نەبێت، سزایەکی بەهێز بۆ خەت خەتۆکی دابنرێت. سەدان کۆڕو سیمینار لەسەر ترسناکی خەت خەتۆکێ و تەفروقە لە ڕوی شەرعی و واقیعی پێشکەش بکرێت، حیزب بۆ یەکلاکردنەوی گرفتە ناوخۆییەکان بگەرێتەوە بۆ کارنامەی حیزب، بابەتەکان بەخاتر و صوڵحکاری بەلاڕێدا نەبردرێت، ئەوانەی کە دەیانەوێ حیزب بەکار بهێنن بۆ مەرامی خۆیان و دروستکردنی خەت خەتۆکی ئاگادار بکرێنەوە، ئەگەر ئەنجامی نەبو دور بخرێنەوە، دەوروبەری کەسی یەکەم بەکەسانی خاوەن پەیام و مەبدەئی پڕ بکرێتەوە، لێژنەیەکی قەزائی دادوەر هەبێ لە سەرەوەی پەرژەوەندی حیزبایەتی و پلە و پۆست بێ، بۆ یەکلاکردنەوە و سزادانی ئەو کەسانەی خەت خەتۆکێ دەکەن.

## گرفتی هەشتەم: گرفتی یەك لا نەکردنەوەی دعوە و سیاسەت.

دوای ئەوەی هەوڵ و تەجروبە ئیسلامیەکان لە جیهانی ئیسلامی نەگەیشتنە ئامانج، ئەوەی مەبەست بوو بۆ گەیشتن بە جڵەوی دەسەڵات تا ڕادەیەك شکستی هێنا، بوە مایەی ئەوەی سەرجەم حیزبە ئیسلامیەکان بەخۆدا بچنەوە، موراجیعە دەست پێ بکەن، بزانن هۆکاری شکست خواردنەکان چی بوون، هەر یەك بەجۆرێك پێداچونەوەی کرد لە بوارەکانی؛ فکر، سیاسەت و دەعوە، پاشگری ئیسلامی، قۆناغی مەکی و مەدەنی، فکری جیهادی و جۆرەها تێبینی تر !!! یەکێك لەم خاڵانە هەنگاو نانە بۆ جیاکردنەوەی دعوە لە سیاسەت، واتە پێیان وایە تێکەڵ کردنی سیاسەت لەگەڵ دەعوە هۆکارێکە بۆ دواکەوتنی کاری ئیسلامی، ئەم هەوڵە لە لایەن زۆربەی حیزبە ئیسلامیەکان درا، وەك حیزبی حوریەو عەدالەی میسری، حیزبی عەدالە و تەنمیەی مەغربی، جەمعیەی دەعەوەی لێ جیابۆوە، لە تورکیا و سودان و حیزبەکانی جیهانی ئیسلامی دەردەشە کرا، هەروەها نەهزەی تونسی بەعەمەلی دەعوەی لەسیاسەت جیاکردەوە، ئەم بیرۆکەیە تازە لەکوردستان تەشەنە دەکات و باس و خواسی گەرمە[١]، هەندێك هەوڵ درا لەلایەن حیزبە ئیسلامیەکان بۆ جیاکردنەوەی دەعوە لەسیاسەت، وەك جیاکردنەوەی کەناڵی ڕاگەیاندن، بەشی زانایانی ئایینی، بەڵام دواتر کاڵ بۆوە، هەستیان کرد خەڵك پێی هەزم ناکرێ و دور دەکەوێتەوە بۆیە جارێکی تر گەڕانەوە سەر هەمان شێواز، پێویستە بە وردی هەندێ لایەنی ئەم بابەتە بخەینە ڕوو:

---

(١) زۆر بە داخەوە زۆر جار پێداچونەوەکان لە وڵاتی خۆمان هەڵقوڵاوی بیر و داهێنانی خۆمان نیین، لە وڵاتێکی تر تەجروبەکە کراوە، دەیانەوێ کۆپی بکەن، ئەمە هەڵەیە و هەر وڵاتێك تایبەتمەندی و جیاکاری و دەردو کیشە و گرفتی خۆی هەیە، جیاوازە لەگەڵ ئەوانی تر، دەبێ خەڵکی خۆی بەپێی تێڕوانینی ورد چارەسەری بکات.

## ئیسلام دینێکی گشتگیرە:

بێگومان ئیسلام دینێکی گشتگیرە و هیچ بەشێکی ژیانی فەرامۆش نەکردوە، سێکوچکەی پەیوەندیەکانی نێوان تاك و خودا و خۆت و کومەڵگای بەوردی شیکردۆتەوە، تەواوی ئاداب و ئەحکامەکانی بە کۆی مەرجەکانەوە دیاری کردوە، تێڕوانینی بۆ مرۆڤ، ژیان، بونەوەر بەدرێژی داڕشتوە، بێگومان سیاسەت و دەعوەش دوو چەمك و جومگەی سەرەکی هەموو فکرەو ئاین و ئاییدیایەکن، ناکرێ مەرج و تایبەتمەندی و شیکاری وردی لەسەر نەکرابێ. دەعوە دینە و سیاسەتیش دینە.

## سەردەمەکان جیاوازن بۆ ئیدارەدانی دەعوە و سیاسەت و دەوڵەتداری.

پێش ئەوەی قسە لەسەر جیاوازی ئیدارە دان بکەین، پێویستمان بە پیناسەیەکی کورت و پوختی سیاسەت و دەعوە هەیە. تاوەکو بزانین پێکەوە گرفتن یان نا؟.

**پێناسەی سیاسەت:** واتە ((هونەری بەڕێوەبردنی کومەڵگای مرۆڤ))(١).

لەلای ابن عقیل، سیاسەت زۆر بەفراوانتر و گشتگیر تر باس کراوە دەفەرموێت: ((هەموو هەڵسوکەوتێکی دەسەڵاتی سیاسیە کە خەڵك نزیك بکاتەوە لە چاکسازی، وە دوریان بخاتەوە لە خراپەکاری، با لەشەریعەتیش نەهاتبێ بەڵام بە مەرجی ئەوەی دژ و پێچەوانەی شەریعەت نەبێ(٢).

بەڕێوەبردنی کومەڵگا، سەرو کارکردن و ئیدارەدان و پاراستن و ڕێکخستنی ژیان و گوزەران و کاروباری سیاسی و دبلۆماسی و پەیوەندییەکان و جەنگ و ئاشتی و پەروەردە و فێرکردن و بەڕێوەبردنی سەرجەم کایە و جومگەکانی وڵات هەموی هونەری بەڕێوەبردنە.

---

(١) بڕوانە : موسوعة العلوم السیاسیة ص١٠٢.

(٢) لە کتێبی (الطرق الحکمیة) نەقل کراوە.

**پێناسەی دەعوە (بانگخوازی):**

ئیبن تیمیە دەعوەی وا پێناسە کردوە دەفەرموێت: (بانگخوازی بۆ لای خودا، بانگخوازیە بۆ ئیمان هێنان بە خوداو بەوەی پێغەمبەران پێی هاتوون، وە بەڕاست دانان و بڕوا هێنان بە پێغەمبەران و بەوەی لەلای خودا هێناویانە، وە گێڕایەڵی کردنی ئەم فەرمانانەیە کە کردویانە، ئەمەشیان شایەدی هێنان و بەرپاکردنی نوێژ و ئەدا کردنی زەکات و ڕۆژوی ڕەمەزان و حەجیماڵی خودایە، بانگەوازییە بۆ ئیمان هێنان بە خودا و بە مەلائیکەت و کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران و زیندو بونەوە دوای مردن و قەدەر بە خێر و شەڕیەوە[1].

بێگومان دەعوە کاری هەرە سەرەکی و گرنگی پێغەمبەران و خولەفای ڕاشیدین و زانا و بانگخوازانە، باشترین کردەوەیە دوای ئیمان هێنان، دیاری کردنی ڕاست و ناڕاست، خێرو شەڕ، حەڵاڵ و حەڕام، حەق و باتل، ڕوناکی و تاریکی، چاکەو خراپە بەکاری دەعوە جیادەکرێتەوە. دوای ئەم دوو پێناسەیە بۆمان دەردەکەوێ سیاسەت و دەعوە سەرچاوەیان یەکە کە شەریعەتە، بەڵام جێبەجێ کردنیان یەکجار جیاوازە و لە سەر دەمێکەوە بو سەردەمێك، لە شوینێکەوە بۆ شوینێکی تر گۆڕانکاری بەسەر دادێت. لە ئێستادا دونیا بۆتە جیهانگیری خەڵك لە بازنەی زانیاری لۆکاڵی گوازراوەتەوە بۆ زانیاری جیهانی، پانتایی فێربونی زۆر فراوان بوە، لە جیاتی یەك سەرچاوەی فێر بوون بەهەزاران سەرچاوە، بە یەك کلیك لەلا دەست دەکەوێت، لە دێیەك بێت، یان لەناو شار، کەواتە شێوازی سیاسەت کردن و هونەری بەڕێوەبردن زۆر گۆڕانکاری بەسەر داهاتوە، زەمەن و لۆژیك و واقیع لێت قبوڵ ناکات، بەم زانیارییە کرچ و کاڵە بێیتە مەیدان و بە سیاسەتی حیزب وڵات بەڕێوە ببەی، هەروەك و بەهەمان شێوە بانگخوازی پێویستی بەزانیاری ورد و زانستی و واقعیی هەیە، ئەگەر نا شۆڕشی زانیاری ڕۆژانە هەزاران بابەتت بەشێوەیەکی زانستی و شیکاری لێ هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام لەکۆتاییدا مەبەست لە سیاسەت و دەعوە خزمەت کردنە

---

(١) بڕوانە: مجموع الفتاوی ابن تیمیە ، ١٥-١٥٧.

**بە دین و ژینی خەڵك ئەمە مەبەستی سەرەکیە!!! نەك شێوازی ئیدارە دان و چۆنیەتی بانگەوازی کردن بەمەرجێك ڕێگاگان ناشەرعی نەبن. بێگومان ئێستا لە هەموو کات زیاتر ئیدارەدانی وڵات و دەعوەش پێویستی بە وردەکاری زۆر هەیە، تا بتوانی بەجوانترین شێوە بیگەینێ.**

## جیاوازی نێوان سیاسەت و دەعوە:

**ئەم بابەتە تا ڕاددیەك ئاڵوزە، ئەگەر زۆر بە وردی شیکاری بۆ نەکرێت توشی دەیان کلەیی و ڕەخنە دەبینەوە، بە تایبەتی ئەوانەی زۆر ناخوێننەوەو لە دونیای مێژودا دەژیت، بۆ بەرچاو ڕونی پێویستمان بە جیاکارییەکی بەراورد کاری هەیە لە نێوان سیاسەت و دەعوە:**

**١- سیاسەت کەمترین دەقی لەسەرە لە قورئان و سونەت. لە بەرامبەردا: دەعوە زۆرترین دەقی لەسەرە.**

**٢- سیاسەت هونەری ئیدارەدانە و ئیجتاهادی مرۆڤەکانە. لە بەرامبەردا: دەعوە کەمتر مەجالی ئیجتیهادی تێدایە.**

**٣- سیاسەت چوارچێوەی فراوانە. لەبەرامبەردا: دەعوە چوارچێوەکەی تا ڕادەییەك دیاریکراوە.**

**٤- سیاسەت پەرژەوەندی گشتی وڵات دەپارێزرێت. لە بەرامبەردا: دەعوە گرنگی بە کاری بانگخوازی و خواناسی دەدات.**

**٥- سیاسەت زۆرترین هەڵکشان و داکشانی توش دەبێت، بۆ چارەسەر کردنی ئیجتهادی کەسەکانی پێویستە. لە بەرامبەردا: دەعوە زۆرترین دەقی لەبەر دەستە لە کاتی هەڵکشان و داکشانەکان.**

**٦- سیاسەت لەسەردەم و شوێن و کاتەکاندا گۆڕانکاری زۆری بەسەر دادێت تا ئیدارەی حیزب و وڵات بکات. لەبەرامبەردا: دەعوە زۆر جیاوازی نییە .**

**٧- سیاسەت شێوازی گەیشتن بە ئامانجی چەندان ڕێگای فراوان و جیاوازی لەپێشە، وەك ئەوەی خەلیفە بەڕێزەکان بە جیاوازی کردیان. لە بەرامبەردا: دعوە قۆناغەکانی لە چەند هەنگاوێك تێناپەڕێ.**

**٨- سیاسەت پەیوەندی بە وڵاتانی دراوسێ و نیو دەوڵەتی هەیە. لەبەرامبەردا: دەعوە وابەستەی ناوخۆیە زیاتر.**

**٩- سیاسەت کار لە سەر سود و قازانجی حیزب و نیشتمان و وڵات دەکات. لە بەرامبەردا: دەعوە باس لە حەڵاڵ و حەڕام و موژدە دان و ترساندن و بوارە ئەخلاقیەکان دەکات.**

**١٠- سیاسەت بەناوی خودا و قورئان و سوننە هونەری بەڕێوەبردن ناکات، لە چوارچێوەی یاسا گشتیەکانی قورئان و سونەتدا سیاسەتی وڵات بەڕێوە دەبات. لە بەرامبەردا: دەعوە هەمووی پێك هاتوە لە قورئان و سونە و بەڵگەی شەرعی.**

**دیارە کۆمەڵێك خاڵی تر ماون بەڵام لەبەر درێژ بونەوە باسی ناکەین.**

## چارەسەر

## ئایا سیاسەت لە دەعوە جیا دەکرێتەوە یان نا!!!؟؟؟

**جیاکردنەوەی دەعوە لەسیاسەت جیاوازە لە جیاکردنەوەی دین و دەوڵەت، نابێ ئەم دوو مەفهومە تێکەڵ بکرێت، قسەو باسەکە لەسەر دەوڵەت و دین نییە، قسە لەسەر حیزبە، کەبۆتە یەکێك لە ئالیەتەکانی گەیشتن بەحوکم و دەسەڵات، بۆ گەیشتن بەم کاروانە دەبێ کاری سیاسی بکرێت، کاری سیاسیش بنەما و ئالیەت و ئامڕازی سیاسی دەوێت، بنەماکانی کاری سیاسیش هەوڵدانە بۆ گەیشتن بەحوکم، تاوەکو پڕۆژەکانی جێبەجێ بکات، تاگرفتەکانی ئاوەدانکردنەوە و عەدالەتی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و ڕۆشەنبیری و سیاسی چارەسەر بکات، ئەم گرفتانە بەکەسانی پسپۆر و شارەزا چارەسەر دەکرێت، گرفتێکی تەندروستی، یان دبلۆماسی، یان سیاسی بەکەسانی پسپۆر لەم بوارە چارەسەر دەکرێت، نەك زانایەکی بەڕێزی ئایینی بێت وتاری بۆ بدات، عەمەلی سیاسی ڕاوەستاوە لەسەر پێشهات و تەوەقوعات، دەکرێ**

سەرکەوتو بی، دەکرێ سەرکەوتو نەبی، هەر کات کاری سیاسی شکست بێنێ دەعوەش لاواز دەبێ، یان بەلای کەم بەهۆکاری سیاسەت ڕێگری لە دەعوە دەکرێت، دەعوە باجی سیاسەت دەدات، لەکاتێکدا دەبی دەعوە وەك بازنە فراوان و گشتیەکە بپارێزرێت، دیارە لەگەڵ فراوان بونی کاری حیزبی و سیاسەت و دەعوە، تێپەڕ بونی ژیان و زەمەن دونیا بەرەو ئاراستەی پسپۆڕی (التخصص) دەڕوات، هەرچەندە من وەك خۆم بۆچونم وایە پسپۆڕی لەسەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بناغەی داناوە، سەحابە بەپێی پسپۆڕی کاریان دەکرد، بە نمونە زانستی قورئان : ( عبداللەی کوڕی عباس وعبدالله کوری مسعود. ڕاوێژکاری: ابوبكر و عمر. ئەمانەت: ابو عبيده. چاودێری: قیسی کوڕی سعد. زانیاری پەنهان: معيقب الدوسى. وتەبێژ: سابت بن قيس. وەرگێڕان: زید بن سابت. حەڵاڵ و حەڕام: معازی کوڕی جەبل. دادوەری ئیمامی عەلی. ڕاگەیاندن: بیلال. پەیوەندی دەرەوە: جعفری کوڕی ئەبوتالیب، لەگەڵ چەندان پسپۆری تر. لێردا بۆمان دەردەکەوێ فەرقێکی زۆر هەیە لەنێوان جیاکاری (تمييز) لەنێوان سیاسەت و دەعوە لەگەڵ جیاکردنەوە (فصل) لەنێوان سیاسەت و دەعوە، هەر کاتی بڵێین دەبێت جیاکاری بکرێت لەنێوان سیاسەت و دەعوە، بۆ سەرکەوتنی پرۆسەی سیاسی و جوان ئیدارە دانی وڵات و تێکەڵ نەکردنی بەکاری دەعوە، ئەمەیان هیچ تێکگیرانێك نیە لەگەڵ شەریعەت، چونکە لەسەر ئەساسی پسپۆریە و پێویستی ئێستای بەڕێوەبردنی هونەری سیاسەتە، پاراستنی دەعوەیە لە هەمو لەکەیەکی ناتەندروست بۆ بانگخواز و بانگەوازی، دعوەش بەم شێوازە زۆرتر دەتوانی کاریگەری خۆی دابنی و زیاتر بەنێو چین و توێژەکان دا بڵاو بێتەوە.

ئەگەر مەبەستمان ئەوە بێ سیاسەت و دەعوە لێك جیابکەینەوە، واتە (فصل ) بەمانای نەبونی دەعوە لە دەوڵەتداری، یان دەعوە زیادە و کۆمەڵگا پێویستی پێ نییە، یان دەعوە بۆتە بارگرانی نایەڵی سیاسەت سەرکەوێ و دەوڵەتداری بکات، ئەمانە بەهانەی بێ بنەمان، بەم پێوەرە بە پێی سیستەمی موئەسەساتی دامەزراوەی بە هەم ئاهەنگی لە نێوان سیاسەت و دەعوە بە کاری تەواوکاری و پسپۆری تایبەت دەکری، باشترین نمونە پێشکەش بە هونەری بەڕێوەبردن و دەعوە بکرێت، بەبێ ئەوەی هیچ تێك گیرانێکیش لەگەڵ شەریعەت ڕو بدات.

گرفتی نۆیەم: نەبونی نەخشە ڕێگای دوور و درێژخایەن. (التخطیط).

سیاسەتی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا و حیزبە سێبەرەکان بەرامبەر بەحیزبە ئیسلامیەکان گۆڕاوە، لە دوای نەمانی دەسەڵات بەدەست موسڵمانانەوە نەخشەی جیاوازیان هەیە، کەواتە بۆ بەشداری کردنی بزوتنەوە ئیسلامیەکان لەسیستەمی ئەمڕۆ پێویستمان بەم نەخشە ڕێگایە ستراتیجییە جوانە هەیە کە بیرمەندی مەغریبی ڕەشید مقتدر دەڵێت: (استلزم تعدداً فی الاستراتیجیات، ونوعاً فی السیاسات، واختلافاً في التكتيكات، وهو مايؤكد فرضية وجود سياسات في التعامل مع الإسلاميين لاسياسة واحدة، وتجسد هذا المسار في ثلاثة سياسات، السياسة الإدماجية المنفتحة، السياسة الإدماجية المترددة، السياسة الاقصائية)[1]. واتە : پێویست دەکات ئیسلامیەکان چەند جۆرێکی جیاوازی ستراتیچیەتی سیاسی پەیڕەو بکەن، و جۆرێکی لە سیاسەتی تایبەت و تاکتیکی جۆراو جۆر پەیڕەو بکەن، ئەمەش بۆمان دوپات دەکرێتەوە کە سیاسەتی هەڵس و کەوتکردن لەگەڵ ئیسلامیەکان یەك سیاسەت نییە، بەڵکو چەند سیاساتێکە، ئەم جۆرە سیاسەتەش لە سێ ڕێچکەی سیاسی جیاواز خۆی دەبینێتەوە، سیاسەتی پێکەوە هەنگاونانی کراوە، سیاسەتی پێکەوە هەنگاونانی ناجێگیر، سیاسەتی پەڕگیر.

شێوازی سیاسەت کردن و هەڵسوکەتی سیاسی زۆر گۆڕاوە، جیهان ئەمڕۆ بەشێوازیکی سەیر لەگۆڕانکاری و فراوان بوندایە، ئەگەر ئەم (٢٠)ساڵە بەنمونە وەرگرین دەبینین دونیا لەگۆڕانکاریەکی خەیاڵی دایە، لەڕوی ڕاگەیاندنەوە (٥٠) بەئەندازەی پێشوو پەرەی سەندوە، لەگەڵ پێش خۆی گۆڕاوە، لەڕوی سیاسەت، هەواڵگری، سەربازی، تەکنەلۆژیا، مەناخ، کەش و هەوا، تادەگاتە هاوپەیمانی نێو وڵاتانی زڵ هێز و ئیقلیمی، چەندان وڵات و دەسەڵات لەناوچون و نەماون، شەڕی سارد لە نێوان زۆر وڵاتاندا دەستی پێ کردوە، تەکانی ئابوری خەریکە عەقڵ ڕادەگرێ، ئەم

---

(١) بڕوانە: الإدماج السياسي للقوى الإسلاميه بالمغرب، لا ١٣٥-١٣٧. هەروەها: الاسلاميون ونظام الحكم الديموقراطي، اتجاهات وتجارب، المركز العربى للأبحاث ودراسة السياسات، مجموعه مئولفين، لا ٢٣٧.

هەمو گۆڕانکارییە تۆی حیزبی ئیسلامی هەر لەشوێنی خۆتی، بەتەما نییە نەخشە ڕێگاکەی (٣٠) ساڵ لەپێش ئێستا دایڕشتوە بی گۆڕی و بەخۆدا بچێتەوە، موراجیعە بەکار و چالاکی و شێواز و ئالیەتی کارکردن بکاتەوە، چۆن ئەم هەمو گۆڕانکاریە جەزریە کاری لە هەمو هەنگاوەکانی ژیان کردوە، چۆن کاری لەسیاسەت و ئیدارەو نەخشەی حیزبی ئیسلامی نەکردوە، چەند نەخشە ڕێگا ئامادەکراوە، بۆ ئەم شەپۆلە گەورەو بەهێزە، چی ئامادەکراوە بۆ تەوزیف کردنی ڕوداوەکان لەپێناو پرۆژە و بەرژەوەندیەکان، ئایا ئالیەتی کارکردن بەهێز کراوە؟ تا بتواندرێت ئەولەویات بۆ کاری داهاتو دابنرێت، چ خۆ ئامادەکردنێك کراوە، واز لە بەسەرهاتی ڕابردو هێندراوە، تا بێنە سەر بیرۆکەی تازە و ئێستا و داهاتوو، چ گۆڕانکاریەك لە بوارەکانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنکی و فکری و ئیداری و ڕۆشەنبیری کراوە، چەند سیناریۆو بژاردە ئامادە کراوە، ئەگەر یەکێك سەری نەگرت ئەوی تر بخرێتە بەرنامەوە.

سیاسەتمەدارانی سیستەمی سەرمایداری و تەنانەت شوعیەتیش کە ئێستا جیهان بەڕێوە دەبەن، لەگەڵ ئەوەی لە لوتکەی هێز و توانای سەربازی و ئابورین، کەچی بۆ هەمو ئەم قۆناغانە بەخۆدا چونەتەوە، غورباتشوف لەکتێبی (بیرسیتروبکا) (عملية إعادة البناء) دەڵێت: هەرچەندە موشەکەکانمان زۆر بەوردی ڕێگا دەبڕن و ئامانجەکانمان دەپێکن، لەگەڵ ئەم سەرکەوتنانەش کەچی تێبینی دەکەم توشی پاشەکشەیەکی ئاشکرا بوینە، دەبێ هەنگاو بنێین، زۆرترین ژمارەی پزیشکمان هەیە، کەچی وەك پێویست نین بۆ خزمەتکردنی هاوڵاتی خۆمان، ئاستی خوێندن و زانکۆکانمان زۆر بەرزە کەچی پێویستمان بەتەکانی زانستی هەیە. ئەمە لەکاتێکدا لە چاو وڵاتە سەرمایەدارەکانی وەك ئەمریکا هەر هیچ نین، ئینجا وا بیر دەکەنەوە. ئێمە لە هەمو ڕوێکەوە لە دواوەین، کەچی هەر وەك ئەوە وایە لەلوتکەی پێشکەوتن بین، بەکاری ڕۆژانە خەریکین، زۆریان دوبارەن، یان دروست دەبن سەرقاڵی چارەسەر و ڕوبەڕو بونەوەین، بیر کردنەوەیەکی ستراتیجی و نەخشە ڕێگایەکی دورو درێژمان نیە، تەنها گوتارمان هەیە، باسی نەزەری دەکەین، لەگەڵ ڕابردو دەژین خەمی ئێستا و داهاتومان نییە.

## چـــارەســـەر

نامەوێ لەڕوی تیۆریەوە باسی نەخشە ڕێگا بکەم، یان وەك گەشە پێدانی مرۆیی بچینە دونیای خەیاڵ، تەنها زاراوە بەکار بهێنین، هەروەها قسە لەسەر ئەم هەمو ئایەتە پیرۆزانەی قورئان و سونەت و سیرەی پاکی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)) ناکەم، کەچۆن نەخشە ڕێگایان دارِشتوە، چونکە ئەم نوسراوە بۆ ئەوانەیە لەبواری تیوری و وتارو دەقەکان شارەزان، ئەوەی باسی دەکەم نەخشە ڕێگاو چارەسەرێکی واقیعی ئێستای کاری ئیسلامیە، نەخشە ڕێگای کاری ئیسلامی پێویستی زۆری بەسێ شێواز هەیە: یەکێکیان: نەخشە ڕێگا بۆ ئامادەکردنی توانای مرۆیی، لەبوارەکانی فکرو عەمەلی سیاسی، دبلۆماسی، ڕاگەیاندن، ئابوری، پەیوەندیەکان، زانستی سیاسی، ئیداری، دەوڵەتداری، یاسایی، زوبان و بوارە جیاجیاکانی تر، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە حیزبی ئیسلامی پرۆژەی پێگەیاندنی درێژخایەن و چەند ساڵەی هەبی، لەڕێگەی زانکۆکانی ناوخۆو جیهانی، بتوانی تواناو تاقەی مرۆیی دروست بکات بەبەردەوام، بۆ هەر پێش هات و ڕوداو پێویستیەك بگەڕێتەوە بۆ تواناکانی ئەو کەسانەی کەپێگەیاندون بۆ ڕۆژیکی ئاوا، زۆربەی وەزیرو سیاسیە گەورەکانی ئێران دەرچوی زانکۆکانی سۆربون و ئۆکسفورد و زانکۆ جیهانیەکانن، ئەمریکا بەهەمان شێوە، چەند زوبان دەزانن، پسپۆرن لەم پلەیەی پیان دراوە. سەرەتای هاتنەوەی دو حیزبی دەسەڵات زۆر بێ ئەزمون و بێ پسپۆری بون، نەخشە ڕێگایان دانا ئێستا دەیان پسپۆریان ئامادەکردوە لەهەمو بوارەکان، ئێمە تائێستا گرفتمان هەیە یەك پۆست بەکەفائە پڕبکەینەوە، سەرەتای دروست بونمان بەهەر حاڵ دەکری توانای پسپۆری نەبی، بەڵام ئێستا دوای (٣٠) ساڵ لەهەمان گرفت دا دەسوڕێینەوە، یان گرفتەکە قوڵتر بۆتەوە، چونکە هیچ جۆرە پلان و نەخشەیەکمان نییە.

بەشی دووەم: لە نەخشە ڕێگا پێویستمان بە نەخشەی درێژ خایەن هەیە بۆ خۆناساندن بە ئایین و ئایینزا و وڵاتانی دەوروبەرو جیهان، پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) بەنەخشەیەکی ورد لە ڕێگەی نامەکانیەوە پاش ئەوەی نەخشەی ناساندنی پەیامەکەی لە جەزیرەی عەرەب دارِشت و جێبەجێ کرد، دەستی بەنامە ناردن کرد بۆ

مەلیك و ئیمپراتۆرو دەسەڵاتدارەکانی جیهان، لە ڕۆم و فارس و حەبەشەو.. هتد. وەك هرقل و کیسرا و نەچاشی و دەسەڵاتدارەکانی تر، تابزانن نەخشەی داهاتوی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چیە؟ چۆنە؟ بەم نەخشە ڕێگایە توانی دونیای دەرەوە ئاگادار بکاتەوە لەناوەڕۆکی پەیامەکەی، کە شارستانیەت و مرۆڤایەتی و ئاوەدانکردنەوەو گێڕانەوەی شکۆی مرۆڤایەتی هەڵگرتوە، لە بێ نەخشەیی ئێمە ئاین و توێژەکان لێمان دەترسن، وڵاتانی دەورو بەرو جیهان نامانناسن و نازانن پەیامەکەمان چییە؟ چۆنە؟ نەبونی نەخشەیەکی پێانەسەیی وای کردوە بەئاڵۆزی بمێنینەوە.

نەخشە ڕێگای سێیەم: بۆ هەر پێشهاتێك لەگەڵ حیزبەکاتی ناوخۆ و عەلمانیەکان چی بکەین لەکاتی گرژی و ئاڵۆزی، لەکاتی تەبایی و هاوپەیمانی، هەروەها ڕوداوەکانی ناوچەکە، دەوری وڵاتانی خەلیجی عەرەبی بەرامبەر حیزبە ئیسلامیەکان، شیعە و سونە، ڕوداوەکانی ناوخۆی عێراق، وڵاتانی دراوسێ و ناوچەیی و ئەمریکا و هاوپەیمانانی، پڕۆژەی (صفقه القرن)، ئالوگۆڕی چەرخ و کاریگەریە ئەرینی و نەرێنیەکانی لەسەر کاری ئیسلامی، چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ دەرهاوێشتەکانی بکەین، لەگەڵ چەندان مەلەفی ئاڵۆزی تر، کە پێویستە نەخشەی وردی درێژ خایەنی بۆ دابڕێژری، بەداخەوە زۆربەمان هەر لەخەیاڵ نیە.

بۆ هەر یەك لەم نەخشە رێگایانە چەند هەنگاوێکی پێویستە:

هەنگاوی یەکەم: دوای داڕشتنی نەخشە ڕێگاکە پێویستە بزانین چیمان دەوێت لەم نەخشەیە.

دووەم: ئامانج چییە.

سێیەم: ئامرازو ئالیەتەکان چین بۆ جێبەجێ کردن.

چوارەم: دانانی خشتەیەکی زەمەنی.

پێنجەم: دابەشکردنی کارەکان.

شەشەم: بەدواداچون بۆ نەخشە ڕێگاکە.

گرفتی دەیەم: نەبونی ناوەندی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی فکری و سیاسی. (Tink Tank).

لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم گرنگیەکی زۆر درا بەناوەندی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و دیراساتی ستراتیجی فکری و سیاسی، ئەم ناوەندانە پێش ئەوەی بەرهەمێکی ڕۆشەنبیری و مەعریفی بی، سیما و دەستکەوتێکی شارستانی تازەیە لەجیهانی فکرو سیاسەتدا، ئاوینەیەکە بۆ گرنگی دانی میللەتان بە زانست و زانیاری و لێکۆڵینەوە و فەلسەفەی سیاسی و دروستکردنی بڕیار، هەروەها کۆگا و زاکیرەی مێژوو دەستکەوتە فکری و ڕۆشەنبیریەکانە، ڕۆژئاوا و ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پشکی شێریان هەیە لەکردنەوە و گرنگی دان بەم ناوەندانە، هەروەها صین و ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئەرجەنتین و ئێران و تورکیا و کۆمەڵێك وڵاتی تر. سەروەریەکی گەورەیە بۆ شارستانیەتی ئیسلامی (بيت الحكمة) یەکەمین ناوەندی لێکۆڵینەوەی فکری و سیاسی و ڕۆشەنبیری بو، لەسەر دەستی هارون الرشيد کرایەوە، بوە گەورەترین ناوەندی جیهانی بۆ لێکۆڵینەوە. تەکانێکی نەوعی بەزانست و فکردا، بوە پێشەنکی ڕۆشەنبیری، کاری لەسەر لێکۆڵینەوە و توێژینەوە کرد، لە بواری پزیشکی و فەلسەفی و وەرگێڕان و گوازتنەوەی زانست و شارستانیەتی جیاواز، هەروەها زانست و شارستانیەتی ئیسلامی بە هەمو دونیا ناساند، فەلاسیفە و بیرمەندانی هەمو دونیا دەهاتنە سەردانی ئەم ناوەندە[1].

ئەو وڵاتانەی پێشەنگیان هەیە لە ئیدارەدانی سیاسەتی وڵاتان و خاوەنی شارستانی نوێن، سەدان ناوەندیان کردۆتەوە، سەرۆکی وڵات پشتگیریان لێ دەکات، زۆرترین بوجەی تایبەتی بۆ سەرف دەکرێت، بونەتە سەرچاوەی بڕیاری سیاسی و ستراتیجی قوڵ. هەمو بڕیارە چارەنوس سازەکان لەوێوە دەردەچن، ئالنگاری و گرفتە قوڵەکان لەوێوە توێژینەوەی لەسەر دەکرێت و چارەسەری بۆ دەدۆزرێتەوە.

---

(١) بڕوانە: د.صالح محمد زكي، مراكز البحث العلم: نظرة في النشأة والغايات، ويوجد على الرابط ادناه:-http://www.arrafid.ae/arrafid/p5_8.

## کاری ناوەندی لێکۆڵینەوەی فکری و سیاسی

گرنگی دان بە ناوەندی لێکۆڵینەوە، نیشانەی سیمای شارستانی و نەخشەی ستراتیجی و تەکانی زانستیە، لەگەڵ بەرەو پێش چونی شارستانەت و دونیای جیهانگیری، دونیا بەرەو کاری پسپۆری هەنگاوی نا، هەنگاوەکانیش لەسەر داتاو زانست و زانیاری ورد دەبێ بینا بکرێت، دەوڵەتداری و کاری سیاسی و حیزبی پێویستی بەزانیاری و زانست و فەلسەفەی سیاسی زۆر ورد هەیە، ئەمانەش تەنها بەناوەندی لێکۆڵینەوە دەکرێت، کەسانی خاوەن زانستی تایبەت و پسپۆری ورد دەور لەم ناوەندانە دەبینن، ئەمەش سیمای خاوەن زانستەکان نیشان دەدات بۆ هەر میللەتێك، بەکورتی باسی گرنکترین کارەکانی ناوەندی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی فکری وسیاسی دەکەین، تابزانین چ کەلێنێکی گەورە لەکاری ئیسلامی هەیە، بەهۆی نەبونی ئەم ناوەندانە: ناوەندی لێکۆڵینەوە هەوڵی دیاری کردنی دیدگاو بەلوەرەکردنی دەدات. بۆتە ڕائیدی عەمەلیەی سەرکردەی سیاسی و فکری. ئالیەتێکی سەرەکیە بۆ پرۆژە ستراتیجیە گرنگ و کاراکتەرەکان. ڕەسم و نەخشە ڕێگای ستراتیجی سیاسی و فکری دەکێشێ. هۆکارە بۆ گۆڕانکاری و هەستانەوەی میللەتان، ئاراستەی بواری سیاسی و فکری و فەلسەفی و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و ئابوری دەکات. داڕێژەری دروستکردنی بڕیاری سیاسیە، لێکدانەوە بۆ واقیع دەکات، پرۆژەی داهاتوو پێشکەش دەکات بۆ هەستانەوە و پێشکەوتن. لێکۆڵینەوەی زانستی و فکری و ستراتیجی لە بوارە جیا جیاکاندا دەکات، سەرجەم تواناداری و پسپۆر و زاناکانی بواری فکری و سیاسی و فەلسەفی لەخۆکۆدەکاتەوە.

**تایبەتمەندییەکانی ناوەندی لێکۆڵینەوەی فکری وسیاسی سەرکەوتو :**

١- گرفتە ناوەکیی و دەرەکی و پێشهاتەکانی حیزب شیدەکاتەوە، ئالنگاری و چارەسەری بۆ دەخاتە ڕوو. بەشێوازی ڕێکخراوەیی. دوور لە ئیدارەدانی عەشایری.

٢- پێش ڕودانی ڕوداوە نەخوازراوەکان نەخشەی خۆ ئامادەکردن دادەنێت بۆ ڕوداوەکە. بە داتا و ژمارە ئەنجامی ڕاپرسی ناو حیزب و پاشەکشەو پێشکەوتن و خاڵی ئیجابی و سلبیت بۆ دیاری دەکات .

٣- ڕەحم بەکەس ناکات، موجامەلەی کەس ناکات، لایەنگیری کەسی دیاری کراو ناکات، بەپێی زانست و فەلسەفەی فکری دەرئەنجام دەردەخات.

٤- لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی مەیدانی ئەنجام دەدات، لە هەر بابەتێك کە توێژینەوەی لەسەر بکات، بەرچاو ڕونی تەواو دەداتە سەرکردەی سیاسی حیزب.

٥- دیراسەی ناوچەکە و ئیقلیمی و دەولی دەکات، لەو بابەتانەی پەیوەندیان بەکاری سیاسەتکردنی حیزب هەیە. بۆ هەر بابەتێك مەلەفی تایبەت دەکاتەوە، تاوەرەقەکان تێکەڵ نەبن.

٦- ئامانج و موهیمەی ناوەند دیارە، بە جۆرێك دەتوانی پشتگیربێ بۆ دروستکردنی بڕیار، هەروەها بوارێکی تایبەت هەڵبژێرێ لەبوارەکانی سیاسی و ئابوری و سەربازی و فکری، یان چەند بوارێکی جیاواز بە مەرجێك بۆ هەر مەلەفێك کەسانی پسپۆری بۆ دادەنێت.

٧- کۆکردنەوەی کۆمەڵێك بیرمەند و پسپۆر و شارەزا و ئەکادیمی لەبوارە جیاجیاکان. دەبێتە ناوەندی ناسین و دۆزینەوەی تواناکان و ناوەندی ڕاهێنانی پسپۆر و کەسایەتی بەتوانا [1].

٨- سود وەرگرتن لە توانا جیاوازەکان. تەوفیر کردنی سەرکردەی مەیدانی.

٩- کرانەوە بەڕوی کۆمەڵگا، تێکەڵبون لەگەڵ گرفتەکانیان، لەڕێی لێکۆڵینەوە و چارەسەرەکانی. ئاراستەکردن و وشیارکردنەوەیان، هەروەها دروست کردنی ڕای گشتی.

---

(١) بڕوانە: عباس أبو غانم، مراكز الأبحاث بين صناعة الأفكار وترشيد السياسات، اسلام أون، تموز/يوليو ٢٠٠٥، ينظر الرابط الآتي: http://www.onislam.net/arabic/madarik/culture-ideas/٩٦٧٣٨-٢٠٠٥-٠٧-١٢٪٢٠١٧-٤٢-٢٥.html.

١٠- داهێنان و نوێکاری دەکات، دارشتنی سیناریۆ و بژاردەی جیاواز، بۆ بەردەوامیدان بە پێشکەوتن، بابەتی نیشتیمانی و ئینتیما.

١١- دروستکردنی تۆری پەیوەندی لەگەڵ ناوەندە جیاواز و ستراتیجیەکانی هاوشێوە، بۆ گۆرینەوەی خیبرە و تواناکان و سود وەرگرتنیان(١).

## کارا کردنی ناوەندی لێکۆڵینەوە:

بە پێویستی دەزانم چەند خاڵێك بە کورتی باسی کاراکردن و تەفعیل کردنی ناوەندی لێکۆڵینەوەی فکری و سیاسی بکەم:

١- تا حیزب گەشە بکات و توانای فکری سیاسی زیاد بکات، گرنگی بە بەدامەزراوەیی کردنی حیزب بدات، ناوەندی لێکۆڵینەوە زیاتر گەشە دەکات و کارا دەبێت.

٢- سەربەخۆ بون لە کاری لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی. سنور دانان و گۆشەگیر کردن و بەرتەسککردنی کاری ناوەندی لێکۆڵینەوە پەك دەخات.

٣- پێدانی زانیاری. ناوەندی لێکۆڵینەوە وەستاوە لەسەر زانیاری راست و دروست و ورد، بۆ کارا کردنی ناوەند، پێویستە حیزب بەتەواوی پشتگیری و یارمەتی بدات لە پێدانی زانیاری.

٤- قەناعەت و بروابون بە زەرورەتی ناوەندی لێکۆڵینەوەی فکری سیاسی، ئەگەر حیزب ئەم ناوەندە بەگرنگ بزانی گرنگی پێدەدات و کارا دەبی.

٥- سەربەخۆیی ناوەند. لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستی پێویستی بەسەربەخۆییەکی تەواو هەیە، نابی حیزب و کەسایەتی سیاسی دەستی تێوەر بدات(٢).

---

(١) بروانە: د.حسين علاوي خليفة، مراكز الدراسات واثرها في ادارة الإستراتيجية الإقليمية: دراسة في برنامج الأمن والدفاع للإتحاد الخليجي، ينظر الرابط الآتي: http://www.iasj.net/iasj?func=fulltext&aId=94824.

(٢) بروانە: دور المراكز الأبحاث والدراسات في صنع القرار السياسي:ايران نموذجا،٢٠١٥. هەروەها: د. شاهر إسماعيل،دور مراكز الدراسات في صنع السياسةالخارجية الامريكية،٢٠١٥،

گرنکترین ئەو ناوەندە فکری و ستراتیجیە سیاسیانەی کاریگەریان لە جیهان هەیە و ناوەندی دروستکردنی بڕیارن:

**ناوەندی بروکینجز لە واشنتۆن:**

یەکێکە لە پێشەنگترین ناوەندی فکری و ستراتیجی سەربەخۆ و شەفاف، لە بواری لێکۆڵینەوە و زانستی کومەڵناسی و ئابوری و سیاسەتی دەرەوە و سیستەمی حوکم کار دەکات.

**ناوەندی (تشاتام هاوسی بریتانی) تایبەت بەکاروباری دەولی:**

ئەم ناوەندە لە دوای کۆنگرەی باریسی ساڵی (١٩١٩) دامەزرا، لە ڕەسەن ترین ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەی بەریتانییە، کار لەسەر ڕۆژنامەنوسی و کۆمەڵگای مەدەنی و بواری دبلۆماسی دەکات، لێکۆڵینەوە لەکاروباری ڕوداوە نێودەولیەکان دەکات.

**ناوەندی بروغل ی بەلجیکی:**

لە ساڵی (٢٠٠٥) دامەزراوە، برغول ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی ئەوروپی و تاقیگەیەکی زیندوی سیاسەتی ئابوریە، کاریگەری لەسەر ئەوروپا هەیە لە ڕوی بڕیارەوە.

**ناوەندی ستۆکهۆڵم ی نێو دەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوەی ئاشتی لە سوید:**

ئەم ناوەندە تایبەتە بەململانێ و داڕنینی چەك، لەساڵی (١٩٦٦) دامەزراوە.

**ناوەندی نیو دەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوەی ستراتیجی بەریتانی:**

ئەم ناوەندە لەساڵی (١٩٥٨) لە بەریتانیا دامەزراوە، لە بواری ئاسایشی جیهانی و مەترسیە سیاسیەکان و ململانێ سەربازی پێشەنگە[1].

---

هەروەها: د.كاظم البطاط.البناء العلمی واهمیة مراكز الدراسات والبحوث.

(١) بروانة: صنع القرار السیاسي في منظمات الإدارة العامة ، القاهرة ، مطابع الهیئة المصریة

**دامەزراوەی ڕاند بۆ لێکۆڵینەوە و دیڕاساتی فکری و سیاسی:**

یەکێکە لە بەهێزترین دامەزراوەکانی ئەمریکا، کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر سیاسات و ناوەندی بڕیاری ئەمریکا، ڕاند کورتکراوەی دوو وشەی (بحث – تطور)، (لێکۆڵینەوە و گەشەسەندن)ە، پسپۆرە لەکاروباری هەردوو وەزارەتی دەرەوە و بەرگری ئەمریکا، لەساڵی ١٩٤٨ دامەزراوە، کۆمەڵێك بیرمەند و گەورە پیاوانی کۆمپانیای دۆغراس بۆ دروستکردنی فڕۆکە لە سانتا مۆنیکا جیابونەوە و ئەم ناوەندەیان دروست کرد، هەروەها کۆمەڵێك لە ناودارانی بواری سیاسی وەك: (بۆل اونێل) وەزیری خەزانەی ئەمریکی پێشوو، (هارولد براوان) یەکێك لە ڕاوێژکارانی ناوەندی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی و دەولی. (دافید ئارون) جێگری ڕاوێژکاری ئاسایشی قەومی سەرۆکی پێشوی ئەمریکا (کارتر) بو لەکۆشکی سپی. ئەم ناوەندە زۆرترین بیرو پرۆژەی لە هەموو بوارەکان پێشکەش ئەمریکا کردوە، بەتایبەتی لەسەردەمی ئەتۆمی.

ناوەندی ڕاند ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوە لە ئیدارەدانی باشی سیاساتی ئەمریکا، پاراستنی بەرژەوەندیەکانی، پێدانی زانیاری ورد و پڕ داتا، چاو نەترسی لە دەست خستنە سەر برینەکان بەچارەسەرەوە، چالاکیەکانی لە بواری کتێب و بڵاوکردنەوەی بەحس و سیمینار و هاوکاری بەربژێری هەڵبژاردنەکان، بۆ سەرۆکایەتی و کۆنفراسی زانستی لە بارەی بابەتە سیاسی و ئابوری و سەربازی و ئاسایش کە پەیوەندیان بەئەمریکاوە هەیە.

---

للكتاب، السيد عليوه، ١٩٨٧. ومراكز الأبحاث وصنع السياسة الامريكية في القرن الحادي والعشرين، شبكة المعلومات العالمية : متاح علي الرابط:http://www.siironline.org/alabwab/derasat(0)/.33htm.هەروەها: دور مراكز الدراسات في صنع السياسة الخارجية الأمريكية، تاريخ الاطلاع ٢٢/٤/٢٠١٨، شاهر إسماعيل الشاهر، متاح علي الرابط: .http://the voice freason.de.. جايمس تومسون، مؤسسة راند البحثية، علي الموقع الالكتروني:(www.wise-gater.org). مؤسسة راند –المعرفة علي الموقع الالكتروني: / http /www.marefa.org).

لەدوای ١١ ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، زۆرترین کاری لەسەر موسڵمانان و جیهانی ئیسلامی کردوە. فکری ئیسلامی و سیستەمی ئیسلامی بە مەترسی وەسف دەکات، لەساڵی ٢٠٠٥ ڕاپۆرتێکی دەرکرد بەناوی (الاسلام المدنی الديموقراطی – الشركاء والموارد والاستراتيجيات)، مەبەستی لەم ڕاپۆرتە ئەمریکا ئاگادار بکاتەوە لە مەترسیەکانی موسڵمانان وەك خۆیان دەڵێن، هەروەها کاری لەسەر پرسە هەنوکەییەکان کرد، وەك جەنگی ئەفغانستان، تاقەی ئەتۆمی ئیسرائیل، تەرازوی هێز لەنێوان و ئەمریکا و سین، کشانەوەی عێراق لە ئەمریکا، لەبەر ئەم وردە کاریانە ناوەندی ڕاند زۆرترین کاریگەری هەیە لەسەر ئیدارەی ئەمریکاو ناوەندی بڕیار[1]، ئەمریکا و وڵاتانی ئەوروپی ئیدارەی دونیا دەکەن زۆر بەسەرکەوتویی، هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنەکەیان بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ناوەندە لێکۆڵینەوە ستراتیجیانە و گرنگی دانیان بە ڕۆڵ و بەرهەمەکانیان، لەکوردستان ئێمەی ئیسلامی لە سەردەمی شەڕی زانیاری و تەکنەلۆژیا و داتا هیچ گرنگیەك بەم ناوەندانە نادەین، ئەگەر بەشێوازێکی زۆر جوزئیش هەبی گرنگی پێ نەدراوە، هیچ بوجەیەکی بۆ تەرخان نەکراوە، پیاوانی پسپۆڕو بیرمەند شارەزای لێ کۆنەکراوەتەوە، گوێی بۆ نەگیراوە، بۆیە زۆربەی کارە سیاسی و تەنانەت دەعویەکانیش لەسەر بەتەمای خودای دەڕوا، نەك دەست گرتن بە سوننەنی خودای و یاسا نەگۆڕەکانی کار کردن، ئەمانە وای کردوە هیچ لە پێوانە و موعادەلە سیاسی و دبلۆماسیەکان نەگەین، قسە و بڕیار و سیاسەت کردنمان کەسی یەکەمە، بۆتە عەلامەی زەمانە هەرچی بڵی دەزانی و ئاگای لێیەتی، ئەمەش نەتیجە و دەرئەنجامی هەر کارێکە، کە عەشوایی و بێ لێکۆڵینەوەی ستراتیجی و فکری و سیاسی هەنگاو بنێت.

---

(١) بروانة: خالد وليد محمود، دور مراكز الأبحاث في الوطن العربي: الواقع الراهن وشروط الفاعلية، المركز المصري للأبحاث ودراسة السياسات، يناير ٢٠١٣. و مؤسسات الفكر ودورها في صياغة السياسة الخارجية للدولة، مركز الامارات للدراسات العربية والقانون، مجلة القادسية للقانون والعلوم السياسية، العدد الثاني. د. بسمة خليل نامق ، ٢٠٠٩. وعبد الله بن سميط، مؤسسة راند وصناعة القرار: مجلة العصر ٢٠١١ علي الموقع الالكتروني (www.alasr.ws).

چارەســەر :

ناوەندی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە بۆ سەردەمی ئێستا پێویستێکی زۆر گرنگە، بەداخەوە ئەم بابەتە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی، لە هەرێمی کوردستان بەتایبەتی، لەلای ئێمەی ئیسلامی زۆر تایبەتی تر گرنگی پێ نادەین و بەهامشی دەزانین، چونکە تا ئێستا سبغەی عەشایری بە حیزبایەتیمان دیارە، کەسی یەکەم دەبێ هەمو شتێك بێ ، لە هەمو شتێکیش بزانی، نامانەوێ حیزب بە دامەزراوەیی بکەین، بە زانیاری سادەو ساکار واقیعەکە دەخوێنینەوە، سەرکردایەتی سیاسی نایەوێ دان بە ناوەندی لێکۆڵینەوە دابنێ و لە پرۆسەی بڕیار دان بەشداری پێ بکات.

یەکەم: مێژوی ناوەندی لێکۆڵینەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هاڕون ڕەشید کە (بیت الحكمة) دانا، دەبو لەم هەنگاوە زێڕینەی شارستانیەتی ئیسلامی سودمان بینیبایە، لەجیهانی ئەمڕۆ مێژوی ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە دەگەڕێتەوە بۆ (٥٠) کانی سەدەی ڕابردوو، دیارە هیچ سودێکمان لەم تەجروبانە وەرنەگرتوە، یان ئاگاداری جیهانی سیاسەت نین، یان خۆ بەگەورە زانین و سود لەکەس وەرناگرین، یان هەمو شتەکان بە پێی عەقڵی خۆمان بەڕێوە دەبەین، ئەگەر شکستمان هێنا خەڵك تۆمەتبار دەکەین، خۆمان لێ دەرباز دەکەین، عمری کوڕی خەتتاب ڕەزای خودای لێ بی، نە لە دونیای جیهانگیری ژیاوە، نە ئەنتەرنیت و سۆشیاڵ میدیا و ڕاگەیاندنی سەردەمی هەبوە، زۆرترین ئەزمونی لە فارس و ڕۆم و ئیمراتۆرەکان وەرگرتوە، بەلای کەم ئەزمونی (٣٠) ساڵ پڕۆژە و کاری ئیسلامی هەیە لە هەرێمی کوردستان، ئەم ماوەیە دەیان بیرمەندو سیاسی گەورە دروست بون، ئێستا بێ کار لە ماڵەوە دانیشتون، ناوەندێك نیە کۆیان بکاتەوە، سود لە ئەزمونی ئەم ماوەیە وەربگری، لە بورای سیاسی و دەعەوی و فکری، بەپێچەوانەوە تا پێیان بکرێ گۆشەگیر و دوریان دەخەنەوە، نەوەك ڕەخنەیەك بگرن.

دووەم: دەبی حیزبی ئیسلامی ئەگەر بەتەمای سیاسەتە نەخشەیەکی پێگەیاندنی هەبی، سود لە خەڵکی خۆی و دەرەوەی خۆشی وەرگری، بە هیچ شێوەیەك حیزبی ئیسلامی قسە لەکەسێك وەرناگرێ، نای هێنێتە ناو ناوەندەکانی خۆی، ئەگەر

ئینتیمای، یان ڕەئی و بۆچونی وەك هەڵوێستە سیاسیەکانی حیزب نەبی، هەڵوێستی سیاسی واتە ئیجتیهادی سیاسی، دەکرێ ڕاست دەرچێ، دەکرێ هەڵە، کەچی حیزبی ئیسلامی ئیجتیهادێکی کرد لەگەڵی نەبی بە دۆستت نازانی، لە مەکتەبی سیاسی بڕیار دەردەچی فلانە کەس دوور خەنەوە لە ڕاگەیاندنی حیزب و سیمینارو کۆڕەکان، واتە وەلاو بەڕا لەسەر هەڵوێستی ئیجتیهادی سیاسی دادەنێت، ئەمە کارەساتە، عەلمانیەکان جار وایە سود لەدژەکانیشیان وەردەگرن ئەگەر پێویستیان بێت.

**سێیەم:** ساڵانە دەیان گەنجی بە توانا لە پسپۆرە جیاجیاکان دەردەچن، دەبی ئیسلامیەکان ناوەندێکیان هەبی ئەوانە تەوزیف بکرێن، وەك ناوەندێکی پێگەیاندن ڕابهێندرێن بۆ داهاتوو.

**چوارەم:** دەیان مامۆستای زانکۆمان هەیە سەر بەهیچ حیزب و لایەنێکی سیاسی نین، بخرێنە نێو ئەم ناوەندانە.

**پێنجەم:** لەگەڵ بەستنی کۆنفرانسی حیزبی، بودجە بۆ ناوەندی لێکۆڵینەوە تەرخان بکرێت، پلانێکی بێ لایەنانە و شەفاف و ئازاد و سەربەخۆ بدرێتە ئەم ناوەندانەی کار بەشێوازێکی زانستی ورد دەکەن.

## گرفتی یازدەم: تێکگیران لە هەڵسوکەوت و گوفتار و کردار.

لەبەر ئەوەی حیزبە ئیسلامییەکان پاشگری ئیسلامییان پێوەیە، چاویان زیاتر لەسەرە و زۆرتر چاودێری دەکرێن لە لایەن خەڵکەوە، وتاردانیش دیارترین سیمای نوخبە و کەسایەتییە حیزبییەکانە، چونکە بەشێکی زۆریان وتار بێژن، یان مامۆستای ئایینین، یان زانستی شەرعی دەزانن، زۆر لە وتارەکانیش باس باسی مێژوی زێڕینی موسڵمانان بوە، بەتایبەتی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و چوار خولەفای ڕاشدین، خەڵك جوان گوێی بۆ گرتوە، تەماشا دەکات بزانێ لەگەڵ کردارەکان یەکدەگرنەوە یان نا؟ سەرەتای ڕابوونی ئیسلامی زۆر باسی کوفر و ئیمان و وەلائو بەڕائو ئێمە و ئەوان کرا، بەم وتارانە ململانێ و دژایەتی و دوبەرەکی و جیاکاری زۆر دروست بو لەنێوان خەڵکی هەڵگری فکری ئیسلامی و خەڵکە عامەکە، ئەوەی لەگەڵ ڕابوونی ئیسلامی نەبوایە بە جاهیل لەقەڵەم دەدرا، ئەم وشەیەش وینایەکی بۆ گەنجی ئیسلامی دروست دەکرد، وەك کافری قوڕیش تەماشای بەرامبەرەکەی دەکرد، ئینجا گرفتەکە لەوەبو جار واهەبو عامیەکە باوکی بو! یان برای، یان کەسێکی نزیکی، گەنج دەهاتە نێو ڕابوونی ئیسلامی بەشێکی بەکاریگەری ئەم وتارانە، باوك و دایك وکەس و کاری لێ دەبوە دوژمن، بەموشریك و کافرو جاهیلی دەزانی. یان لەکاتی وتاری سیاسی عەلمانیەکان بە دوژمنی دین و ژین وەسف دەکران، لەکاتی هاوپەیمانی کردن لەگەڵیان بانگەشەیان بۆ لستەکە دەکرد، لەولاوە خیتابە دینیەکەیان بەکار دەهێنا وەك کوفر و ئیمان کە دەبوە هاوپەیمانی گوتارە سیاسیەکەیان بەکار دەهێنا، خەڵك لەم وردە کارییە نەدەگەیشت، نەی دەتوانی وتاری دینی و دەعەوی و سیاسی لێك بکاتەوە، هەروەها دروستکردنی ململانێ لەگەڵ شێخ و دەروێش و سەرۆك عەشیرەت و کەسایەتیە کۆمەڵایەتیەکان لە وتارەکان، بەناوی وەلائو بەڕائو کوفر و ئیمان، گەنج وەك سیاسیەکان بیری نەدەکردەوە دەیویست ئەم وتارانە سەت لەسەت جێبەجێ بکات، بۆیە هەمو پەیوەندیەکی دەپچڕاند و دژایەتی دەکردن تا سەر ئێسقان، بەڵام لەولاوە سەرکردەی سیاسی لە بۆنە و ڕوداوەکان سەردانی

شێخەکانی دەکرد و دوعایان بۆ دەکردن کاتێك پرسەیەکیان هەبوایە، یان بروسکەیان بۆ دەکردن، سەردان و دۆستایەتی بەردەوامیان هەبو، تا ئێستاش هەر بەردەوامە لەگەڵ کەسایەتی و سەرۆکی عەشیرەت و شێخەکانی تەریقەت، (دیارە سەردانی و تێکەڵبون بەلای منەوە گرفت نییە بەڵام مەبەست لەکۆمەڵگایە چۆن ئەم تێکگیرانانە جیاکاتەوە) ، ئەمانە گشتی لەبەر چاوی خەڵك بەدژایەتی نێوان کردار و گوفتار لێك دەدرایەوە، ئەوەی لێرە بوە سوتەمەنی تەنها گەنجەکان بون، ئەم تێك گیرانە لە گوفتار و کردار وای کرد موتمانە بە وتارەکان نەمینێ، تاکەکان بڵێن ئەم وتارانە واقیعی نین و تەنها بۆ خەڵکە بۆ خۆیان نیە، کەواتە لەم بارەیەوە نەمانتوانی گوتارێکی هاوسەنگ هەبێت لەنێوان گوفتارو کردار، بەلەبەرچاو گرتنی خەڵك و کەسایەتی و بواری کۆمەڵایەتی و کلتوری کوردەواری، تابنەما شەرعیەکان لەکات و شوێنی خۆی جێبەجێ بکرێت، پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردیش ڕەچاو بکرابایە، بەپێی پلە بەندی هەنگاوە جوانەکانی شەریعەت ئاڕاستە بکرابان. زۆربەی وتارەکان بەپێوەری سەردەمی مەککە و نێوان قوڕەیشی کافرو خەڵکی جاهیلی مەککە و سەحابەکان دەدرا، وەك ئەوەی تازە وەحی هاتبێ و خەڵك لە نوێدا بۆ ئیسلام بانگ بکەین، لە کاتێکدا خەڵکی کوردستان گرفتی ڕوکنەکانی ئیمانی نەبو، بەڵکو گرفتی لە جێبەجێ کردنی سیستەمی ئیسلامی هەبو وەك حوکم، لەولاشەوە وەك ئەوەی عومەری کوڕی خەتاب خەلیفەیەو خەڵکەکەش سەحابەیە، ئەوانی تریش جاهیلی مەککەن، بەداخەوە ئێستاش ئەم هەڵەو پەڵانە بەردەوامن، بێ ئەوەی موراجیعە بە وتار و کردارەکانمان بکەینەوە، یان بە لای کەم بڵێین ئێمە هەڵە بوین ئاڕاستەی ڕاست ئەوەیە. لە زۆر وڵاتانی ئیسلامی موراجیعات دەستی پێ کردوە، سەرکردەی باڵا دانیان بەهەڵەی خۆیان داهیناوە، خەڵك و جەماوەریان لێ ئاگادار کردۆتەوە، تا لە بەردەم قاپی خودا تاوانبار نەبن و چی تریش خەڵکی دڵپاك و سادە و دڵسۆز و گەنج بە لاڕێ دانەبەن.

چــارەســـەر :

خوێندنەوەی کۆمەڵناسی زۆر گرنگە بۆ سەرکردە و حیزبە ئیسلامییەکان، تائاستی کۆمەڵگا و تاکەکان بخوێننەوە، هەروەها ئاستی ڕۆشەنبیری و ئاینی و کۆمەڵایەتی کۆمەلگا لەبەر چاو بگیرێ، دیراسەی گرفتەکانی ڕەوتی ئیسلامی بکەی لە جیهانی ئیسلامی، تا نەکەوینە هەمان هەڵەوە، جیاکردنەوەی خیتابی سیاسی و سەرکردەکانی لەخیتابی دەعەوی، چونکە خیتابی سیاسی پێشهات و تەوەقوعاتە، خیتابی دەعەوی ڕاست و دروست و جێگیرە، مەجالی هەوراز و نشێو و تێکگیرانی نییە، وەك عومەری کوڕی خەتاب سەرکردە سیاسیەکان دەبێ بەکردار پێشی گوفتار، کردەوەکانی خۆیان بسەلمێنن، ئاستی خەڵك و ئەندامانیان بەرز بکەنەوە، لەکاتی هاوپەیمانیشدا بژاردەی دووەم و سێیەمیان بۆ باس بکەن، پێش هەر کارێکی لەم جۆرە مەبەست و ئامانج و هەنگاوەکان بەتەواوی ڕون بکەنەوەو شەفاف بن، لەکاتی هەڵەدا دان بەهەڵەکانیان بنێن، داننان بە هەڵە گەورە بونە، دەقی ئاینی زۆر تێکەڵ بەخیتابی سیاسی نەکەن، بەتایبەتی دەقەکانی ئیمان و عەقیدە، واتە ئەگەر لەگەڵ حیزبە عەلمانییەکان ڕێك نەکەوتن بۆ یەك لیستی بڵێی دەنگدان بەعەلمانیەکان کوفرە، ئەگەر ڕێکیشکەوتی بڵێی ئەمە هاوپەیمانی شەرعیە و بۆ بەرژەوەندی ئیسلامە!. چارەسەر ئەوەیە دەقە جوانەکانی ئایین بەکارنەهێنی بۆ کاری سیاسی، لە پێشدا گوتمان چونکە سیاسەتکردن ئیدارەو هونەرو بەرزو نزمی و دژو هاوپەیمانی و خیدعەو بردنەوەیە، لەبەرامبەردا دەقە ئاینییەکان بنەمای نەگۆڕن، ڕاست و ڕاشکاون، موجامەلە لەگەڵ هیچ کات و ساتێك ناکەن، پێویستیان بەڕازی کردنی هیچ ئاراستەیەك نییە.

## گرفتی دوازدەم: دوور کەوتنەوەی عاقڵمەند و کەسایەتی و بیرمەند و ئەندامان لە حیزب، هەڵەی حیزب لە چارەسەر نەکردنی گرفتی ئەندامانی.

مرۆڤ بەسروشتی خۆی هەڵە دەکات، تەنها پێغەمبەران نەبن، ( سەلامی خودایان لێ بێ ) پارێزراون لە هەڵە. بە پێی قاعیدەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بیت) دەفەرمویێت: هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات، (كل ابن آدم خطاء)[1]. بێگومان نەك تەنها ئەندامان بەڵکو سەرکردەکانیش هەڵە دەکەن، ئینجا ئەگەر لەم قاعیدەیە گەیشتین هەوڵی بەشی دووەمی فەرمودەکە دەدەین بۆچارەسەری.

هیچ کارێکی دەستە جەمعی نییە ئیلا هەڵەو لێك تێنەگەیشتن ڕودەدات، حیزب و سەرکردەی سەرکەوتوو ئەوانەن کە دەتوانن ئەم هەڵانەی ئەندامان، یان عاقڵمەند و بیرمەندو کەسایەتییەکان دەیکەن چارەسەریان بکەن، نەهێڵن ئەندامان و کەسایەتی عاقڵمەند و خاوەن پڕۆژەکان دورکەونەوە. دورکەوتنەوەی نوخبە و کەسایەتی و بیرمەندان لەحیزبی ئیسلامی، حاڵەتێکی ناتەندروست و گرفتێکی گەورەیە لەکاری ئیسلامی لەکوردستان، ئەو کەسایەتی و بیرمەند و توانادارانەی ئێستا لە دەرەوەی حیزبە ئیسلامیەکانن، لەنێو حیزب نەماون ڕێژەیان زیاترە، لەوانەی لەناو حیزبە ئیسلامیەکانن، واتا ئەندام بێت لەحیزب، بە تایبەتی کەسانی خاوەن فکر و ئەزمون و تەمەن و خاوەن پێگەی ئایینی و مامۆستایانی ئایینی و کەسانی عاقڵمەند. ڕۆژێك حیزب ناپرسی باشە دەبی هۆکار چی بێ ئەم خەڵکە دڵسۆزە لە سەرەتا بە ماڵ و ژیان و هەموو توانای خۆی، قوربانی بۆ حیزب داوە؟ ئامادە بوو گیانی خۆی ببەخشێ ئێستا دانیشتوە؟ حیزب لەخۆی ناپرسێ باشە ئەم خەڵکە لێرە و لەوێ ڕۆژانە واز لەکاری حیزبایەتی دەهێنن؟ یان لە ڕێکخراوە مەدەنیەکان کاردەکەن بەپارەو ماڵی خۆیان، بەتوانای فکری و عەقڵی خۆی، لەکارەکانیدا دڵسوزی زۆری تێدایە، بۆ لە ئێمە دوور کەوتونەتەوە؟ یان بۆ دادەنیشن، تۆ بڵێی تەنها ئێوە چاك و پاك و دڵسوز

---

(١) بڕوانە: سونەنی ترمزی، ژمارە ( ٢٤٩٩).

و عاقڵ و سیاسی و دبلۆماسی بن؟ ئەویتر هەموی بە دوای پارە و پلە و پایە و بەرژەوەندی خۆی دەگەڕێ؟ یان هەڵەکە لەوەیە؛ قۆرغکاری هەیە؟ باڵ باڵێن هەیە؟ یان خەڵکی خاوەن فکر و بیرۆکە و پرۆژە و پێشنیار جێی نابێتەوە؟ بۆچی کەسانێك هەن ٣٠ ساڵە لەگەڵ ئەوەی دڵسۆزن بەڵام لە ڕووی بیرۆکە و پرۆژە و بێشنیار لاوازن، بەڵام وەك دەروێش و شێخ هەڵسوکەوت دەکەن، بە هەموو شتێك دەڵێن باش! جێگایان دەبێتەوە؟ بەڵام خەڵکانی ژیر و تێگەیشتوو دەبێ لە ماڵەوە دابنیشێ و شوێن نەبێ لە نێو حیزبی ئیسلامی کار بکات، لە کاتێکدا لە سەرەتاوە بە ماڵ و گیانەوە ئامادە بوو.

ئەگەر وەك بەشێك لەوانەی ماون تەنها بیانگوتبایە ئەشهەدو ئەوا حاڵ و گوزەران و پلە و پایەیی باش دەبوو، بەڵام ئامادە نییە، بۆ ئەوەی ویژدانی ئاسودە بێ، بە هەڵە بڵێ هەڵە و بەڕاست بڵێ ڕاست. دانیشتوە.

ئەگەر نمونەیەك لەسەر مام جلال بهێنینەوە بۆ سود وەرگرتن لە چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ باڵ و کەسە جیاوازەکانی ناو حیزب، ئەم حیزبە پڕە لە مملانێ فکری و باڵ باڵێن و مەدرەسەی جیاواز، لە سەرەتای دورست بوونی کە بەکۆمەڵەی ڕەنجدەران و باڵی شۆرشگێڕان دەستی پێ کرد، توانی ئەم دوو باڵە فکریە کە هەتا سەر ئێسقان لێك جیاوازن بەیەکەوە ببەستێتەوە، دواتر ڕاجیایی لە نێو زۆربەی سەرکردەکان هەبو، لە هەندێ یادەوەری و گێرانەوەی بەسەرهاتی ئەوانەی لەگەڵ مام جلال بون دەڵێن: لەکاتی دروست بونی گرفتێك جار هەبوە بەهەڕەشە، جاریش وابو بەگاڵتە و گەپ و قسەی خۆش، نەی هێشتوە هیچ ئەندامێك واز لەم حیزبە بهێنێت، لە کاتێکدا لەشاخ ئومێدێك بۆ داهاتو بەم شێوازە نەبوو.

بەسەرهاتێکی هەیە لەگەڵ پێشمەرگەیەکی سادە، ڕۆژێکیان پێشمەرگەیەك دێتە لای مام جلال چەکەکەی دادەنێت، دەڵێت مام جەلال من چیتر ناتوانم درێژە بە پێشمەرگایەتی بدەم ئەمە چەکەکە دەڕۆمەوە، پێشمەرگەیەکی سادە ئەگەر بشڕوا هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ، مام جەلال وەڵامی دەداتەوە و چەکەکەی خۆی دادەنێت، دەڵێ بابڕۆین کابرای پێشمەرگە دەڵێ بۆ کوێ؟ دەڵێ تەواو مادام تۆ شۆڕش بەجێ

دێڵی منیش چەك دادەنێم بەجێ دێڵم، پێشمەرگەکە زۆر شەرمەزار دەبێت، دەڵێ سەرکردەیەك ئەوەندە گرنگی بەمن بدات، لەبەر خاتری من هەموو شۆڕش بەجێ بهێڵێ، تەواو دەبێ تا دەمرم لەم سەنگەرەدا بم[١]. دڵنیام مام جلال مەبەستی نەبووە چەك دابنێ، بەڵام بۆ ئەوەی یەك تاکە پێشمەرگە لەدەست نەدات، وە زانیویەتی کە سەرکردە پێویستی بە هەموو تاکێکە و کەس زیاد نییە بۆیە وای کردووە.

ئەی ئێمە بێگومان بەدەیان جار واهەبووە، بە سەد ئەندام لە حیزبی ئیسلامی دورکەوتونەتەوە، نەك چارەسەری بۆ نەکراوە! بەڵکو دەیان تۆمەتیان بۆ هەڵبەستراوە. پێشتر تا لەناو حیزب بوە، بە چاك و پاك و دڵسۆز و بیرمەند وەسف کراون! هەرکە دەرچوون ئیدی دەست بەجێ دڵسۆزەکە ناوو ناتۆرەی سەیری بۆ هەڵدەبەسترێ وەك: بە فیتی فڵانە حیزب وا دەکات، بۆ پارە و پلەیەتی، لێگەڕێ هیچ کارمان پێی نییە ....هتد ئەمانە هەموو بە بەڵگەوە لامانن.!!!

چارەسەر :

چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ هەڵەی ئەندامان بکەین؟

ئەم نوسراوە لەگەڵ ئەوەی هەڵەکان دیاری دەکات، لە کۆتاییدا بۆ ئەوەی چارەسەر بۆحاڵەتی چەق بەستوویی کاری ئیسلامی بدۆزێتەوە، گرنگی زۆرمان بە چارەسەرداوە. ئەوکەسایەتی و ئەندامانەی ئێستا لە کوردستان وازیان لە حیزب هێناوە گورزێکی کوشندە بەکاروانی ڕابوونی ئیسلامی کەوتوە، سەرەڕاری پەرتەوازەیی و لێك ترازان و لاوازی ڕیزی موسڵمانان، ئەوانە یان بەهۆکاری کردنی هەڵەیەك بوە، یان تێك نەگەیشتن هەبوە لە نێوان خۆی و حیزب و سەرکردەکان. بەڵام چونکە حیزب زۆر گرنگی بەم بابەتە نەداوە، زۆر لای گرنگ نەبوە ئەم ئەندام و کەسایەتیانە هەبن یان نەبن، بەشێك لە سەرکردەکانیش، یان بە هۆکاری لاوازی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هەڵەی ئەندامان، یان بەهۆکاری خراپی بیتانەی دەوروبەریان و بەرژەوەندی

---

(١) ئەم بەسەرهاتەم لەزاری پێشمەرگەیەك بیست کە لەگەڵیان بو لەشاخ بەناوی (ق-م).

خوازان، یان بەهۆکاری بە هێزکردنی باڵ باڵێن و بەهێزکردنی باڵەکەی خۆی! کێشەکە چارەسەر نەکراوە، لە کۆتاییدا بە سەدان ئەندام و کەسایەتی بەرەو ماڵ ڕۆیشتون و دانیشتون و بەرێ کراون، ئینجا لەویوە تاکەکانی یەك یەك گورگ خواردونی، دواتر لە جیاتی ئەوەی سەرکردە و حیزب بە پەرۆش بێ بۆیان، چونکە موسڵمانی لەدەست داوە، لە کۆڕ و سیمینار لەبڕی هەنگاونان بۆ چارەسەرو گەڕاندنەوەیان، گوتایانە باش بو رۆیشتن، لە کۆڵمان بونەوە!.

کەچی خوا بەسەرهاتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بۆ دەگێرێتەوە، خەریك بوە خۆی لە بەین ببات بۆ لەدەست دانی کافران کەئیمان ناهێنن ئەوەندە بە پەرۆش بــوە: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَـٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَـٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴾[1]. کەچی ئێمە دڵخوشین بە شکستیان، بۆ؟ تەنها لەبەر ئەوەی لەگەڵ حیزبەکەی من نەماوە، ئینجا چۆن ئێمە سەرکردەین.

چەند وێنەیەك لە هەڵس وکەوتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) لەگەڵ هەڵەی ئەندامانی نمونەی بەرز بۆ ئێمە پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، ئاوڕ لە مێژو بدەنەوە صەحابەکانیش هەڵەیان کردوە، لێك تێنەگەیشتن هەبوە، بەڵام نەگەیشتۆتە لێك ترازان و باڵ و باڵێن و دانیشتنی تاکەکانی دەروبەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

- هەڵەی حاتەبی کوڕی بەلتەعە لەو ڕۆژەی هەوڵی دا هەواڵی فەتیحی مەککە ئاشکرا بکات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم هەڵە کوشندە و گەورەیەی بە ئاسانی چارەسەر کرد[2].

- بەسەرهاتی خالدی کوری وەلید کوشتنی ئافرەتێك بەهەڵە.

چەند قاعیدەیەکی گرنگ بۆ کەسب کردنی ئەندامان و ڕاکێشانی کەسایەتی بۆ نێو کاری ئیسلامی.

---

(١) سورەتی الکهف: ٦.

(٢) بڕوانە: صحيح البخاري باب الجاسوس، ژمارە (٣٠٧).

ئەم یاسایانە بۆ حیزب و سەرکردەکانی گرنگن تا ئەندامەکانی لەدەست نەدات، هەروەها خەڵکی دەورو پشتی کەسب بکات بۆ کاری ئیسلامی، بەکورتی ئاماژەیان پێ دەکەم.

**١- بە گرنگ زانینی هەموو تاکێك لە سەرەوە بۆ خوارەوە، بۆ ئەوەی هەموو تاکێك هەست بە گرنگی وپێگەی خۆی بکات.**

**٢- گرنگی دان بە ڕۆڵیان لە هەر ئاستێك بن.**

**٣- ڕەچاوکردنی ئەندامان و کەسایەتیەکان، چونکە هەموو تاکێك گرنگی خۆی هەیە و پێویستە بۆ کاری ئیسلامی، هیچ کەس زیاد نیە.**

**٤- دانانی کەسی شیاو لە شوێنی شیاو.**

**٥- دورکەوتنەوە لەم جۆرە کردارانە لەگەڵ ئەندامان.**

**١- ڕەخنەی توند و ڕوخێنەر.**

**٢- جەدەل و بەنیەتی شکاندن و بەسەردا زاڵبون.**

**٣- قۆرغکاری .**

**٤- دژایەتی.**

**٥- خۆویستی.**

**٦- هونەری چارەسەرکردنی هەڵە و لێکتێنەگەیشتن لەنێوان سەرکردە و ئەندامان، وەك:**

**١- بەسەردا هەڵداگوتن و ڕێزی زۆر بۆ ئەندامان.**

**٢- ئاگادار کردنەوەیان لە هەڵەکانیان بە شێوەیێکی ناڕاستەوخۆ .**

**٣- دان نان بە هەڵەی خۆت پێشی ئەندامان.**

**٤- ڕاستکردنەوەی هەڵە بە ڕێگای پرسیار و وەڵام.**

**٥- گرنگی دان بە دڵ ڕاگرتنی، نەك کێ ڕاستە و کێ هەڵەیە. بەمەرجی پاراستنی عەدالەت.**

٦- نیشاندانی ئەوەی کە تۆ زۆر گرنگ و پێویستی بۆ کاری ئیسلامی.

٧- پەلەنەکردن لە بڕیاری دورخستنەوە.

٨- باسی ئیجابیات و کەسایەتی نەك سلبیات و شکاندنی.

٩- دورکەوتنەوە لە هەڵچون.

١٠- ڕاوێژکردن لەگەڵ کەسانی ڕاست و عاقڵ، نەك بەرژەوەندی خواز.

گرفتی سێزدەم: گرنگی نەدان بە بواری هونەر و بابەتە تازە و تەکنەلۆژیای سەردەم.

هەر کاتێك نوسراوێکی لەم جۆرە دەنوسم ئازارێك بە دڵم دادێت، چۆن قەڵەم بگرمە دەست و باس لە خاڵێکی لاوازی موسڵمانان بکەم، بەڵام سونەتی گۆڕانکاری وایە ئەگەر دەست لەسەر برینەکان دانەنێیت ناتوانی خاڵی وەرچەرخان بدۆزیتەوە و هەستانەوە بەرپا بکەی. دیارە ئەمڕۆ موسڵمانان پاشەکشەیەکی گەورەیان کردوە لە دونیای تەکنەلۆژیا و هونەر، تەکنەلۆژیا و هونەر دوو ئارەزووی(فیتری) سروشتی مرۆڤەکانن، خودای گەورە مرۆڤی وا سروشتاندووە حەزی لە پێشکەوتن و داهێنان بێ، هەروەها ناخی لەگەڵ هونەر تێکەڵ بێ، بەڵام بەهۆی هەندێ بۆچوونی فقهی و تێگەیشتنمان لە هەندێ دەق، دەرگای هەندێك پێشکەوتن و بوارە هونەرییەکانمان لەسەر خۆمان داخستووە، بەتایبەتی لە سەرەتای هاتنی ڕابوونی ئیسلامی دژایەتیەکی زۆر بەهێزی ئەم بابەتانە کرا، تا تێکەڵ کرا بەئیمان و عەقیدە، بەشێوازێك بوە کلتور و ڕۆشەنبیری لای گەنجەکانمان، وەك ئەوەی بڵێین ئەم بابەتانە لەئیسلام دانین و ئیسلام بەهیچ شێوازێك بیری لێ ناکاتەوە، گەنجەکانمان لەسەر ئەم بیرۆکەیە ڕاهینا، بەردەوام ململانێ لەسەر ئەم بابەتە جوزئیانە بوو، بەڵام ئێستا واقیع پێی سەلماندوین کە هەندێك لەو بۆچوونانە لە هەندێ بواری فیقهی نەیان پێکاوە، چونکە ئەگەر ئیسلام بۆ هەموو سەردەم و زەمەن و میللەت و جوگرافیایەك هاتبێ، ئەمە دووبارە دەڵێین ئەم بۆچوونانە لە بارەی هونەر و داهێنان هەڵەبوون، ئەمڕۆ واقیع چۆن پێی سەلماندووین کە ئەم بۆچونە بۆتە هۆکاری پاشەکشەمان لە بواری پێشکەوتن و هونەریمان. با چەند نموونەیەك وەرگرین:

گوتمان وێنەگرتن حەڕامە، کە بەشێکی گەورەی هونەرە و پێداویستیەکانی ژیانە، ئەوەندەمان ئەو بابەتە گەورە کرد، تا وای لێهات بو بە کلتوری کۆمەڵگامان، تەنانەت وێنەگرتن وەك بت پەرستن و شیرك وێنا دەکرا، جگە لە چوونە جەهەنەم، ئەمە دەرگای لە پێشکەوتنی پزیشکی و ئەندازیاری و بەشێکی زۆری تەکنەلۆژیایی

سەردەم داخست، گەنجان دوای تەواو بونیان لە پۆلی شەشەمی ئامادەیی بەرەو ئەم کۆلیژانە نەدەچون، بەتایبەتی ڕاگەیاندن و ئەوانی نزیك لە بواری هونەرو تەکنەلۆژیا، هیچ گرنگی بە بوارە تەکنەلۆژیاییەکان نەدەدرا، کەچی واقیع پێی سەلماندووین ئەوانەی گوتیان حەڕامە نەیان توانی لەبەر شەپۆلی واقعی تەکنەلۆژیا خۆیان بگرن، بەشێکی زۆری ئەوانەی دەیان گوت وێنە حەڕامە، کەچی ئێستا هەموویان وێنەی ڕۆژانە لەسەر فەیس بووك بڵاودەکەنەوە، موبایلەکەی دەستیان هەمووی وێنەیە، بوارە پزیشکییەکان زۆری بۆتە وێنە، داوودەرمانمان هەمووی وێنەیە، ئەندزیاری هەمووی وێنەیە، هیچ شتێك لەو دونیایە دا نییە پێی بڵێین پێشکەوتن وێنە نەبێت، بە تێپەڕبونی زەمەن بە ناچاری تەسلیمی ئەو واقیعە بوین. بەم هەنگاوانە پاشەکشەی زۆرمان کرد لەڕێی ڕاگەیاندن کەکاکڵی کاری ئیسلامی ئەمڕۆیە.

هونەر بەشێکە لە ویستەکانی مرۆڤ، هیچ موسڵمانێك نییە حەزی لە دەنگی خۆش و بۆنی خۆش و جوانی نەبێ، هیچ مرۆڤێك نییە حەزی لە دەنگی بولبول و چۆلەکە نەبێ، حەزی لە خوڕڕەی ئاوی سازگار و دەنگی شنەی با و قاسپەی کەو و ئاوازی نێو سەر چڵەکان نەبێ، کاتێك بە گشتی دەنگی هونەرمان ڕوونکردەوە و حەڕامان کرد، ئێستا واقیع پێی سەلماندوین تەواوی ئامێرە تەکنەلۆژیاییەکان لە فڕۆکە و ئەسانسەر و دەرگا و تەنانەت میترۆ و تڕام وای و بە شێکی زۆر لە ڕاگەیاندنەکان مۆسیقان، موبایلەکەی دەستیان مۆسیقایە، تەواوی ئامێرە تەندروستیەکان ئاماژەکانیان مۆسیقایە، ئامێرەکانی ئەندازیاری مۆسیقایە، سەرەڕای ئەوانە هەرچی پەیوەندی بە ڕاگەیاندنەوە هەیە بەبێ مۆسیقا بەڕێوە ناچێ، جا ئەگەر ئیسلام گۆشەگیر بوو، بۆچەند کەسێك و شوێنێکی دیاریکراو و سنوردار، ئەوا حەڕامکردنەکەمان تەواوە و گرفتی نییە، با خۆشمان لە دێیەك بژین و لە واقیع دوور کەوینەوە، ئەگەر دینی ئیسلام دینێکە بۆ جیهانیانە، دینی هەموو بەشەکانی ژیانە، دینی گەورە و بچوك، پیاو و ژنانە، دینی ڕەش و سپی و دەوڵەمەند وفەقیرانە، بۆ هەموو سەردەم و شوێن زەمانەکانە، ئەوا نابێ لە تەندروستی و ئەندازیاری و کیمیا و فیزیا و بایەلۆجی و جیۆلۆجی ... هتد، دابڕی، ئیسلام چۆن گرنگی بەلایەنی دینداری دەدا، ئاوهاش دەبێ

گرنگی بە زانستی ئاوەدانکردنەوە بدات، لەوانەیە یەکێك لەولاوە هەڵسێتەوە، دین لەبەر ڕۆشنایی عەقڵی خۆی تەماشا بکات و بڵێت بابە خۆ نابێ دین لەگەڵ واقیع بگونجێنین، بەڵی منیش وا دەڵێم دەبێ واقیع لەگەڵ دین بگونجێنین، بەڵام ئەوەی گوتمان دین نەبوو تێگەیشتنی کەسەکان بوو لە دین، واتە فەهمی مرۆڤەکان بوو، دەکرێ ئێستا دان بنێین کە هەڵە بوو، بۆ ئەوەی زیاتر لە دونیای هونەر و تەکنەلۆژیا دوا نەکەوین چۆن جاران سەردار بووین هەر بەسەرداری بمێنینەوە، دان نان بەهەڵە هەنگاوە بەرەو هەڵسانەوە.

چـــارەســـــەر :

بۆ چارەسەری ئەم بابەتە تەنها پێویستمان بە فقهی سەردەم هەیە، دوور کەوینەوە لەکاریگەرییەکانی نامیلکە نیردراوەکان بەکاریگەری ڕۆژئاوا، زاناو دانایانی وڵات خۆیان فەتوا بدەن و لە دەقەکان بکۆڵنەوە. بۆ درێژەی چارەسەری ئەم خاڵە بگەڕێوە بۆ چارەسەری گرفتی چواردەم.

گرفتی چواردەم: گۆشەگیرکردنی ئافرەت، بەر تەسکردنەوەی ڕۆڵیان لەکاری سیاسی و بانگخوازی.

بێ هودە نییە خودای گەورە ئادەم (علیه السلام) دروست دەکات، خودای گەورە زانایە بەوەی ژیان بەبێ ئافرەت نارِوا ئافرەتێك لە ڕەگەزی مرۆڤەکان دروست دەکات، تا هاوسەنگی لە ژیان دروست بێ، ئەمە پێمان دەڵێ تەواوی ژیان بەسیاسەت و دەعوە و بواری کۆمەڵایەتی و دەوڵەتداریش بەبێ ئافرەت نارِوات، یەکەم چرپەی وەحی کە تەواوی بەشەکانی دونیا و دوا ڕۆژی تێدایە، لەگوێ دایکمان خەدیجە چرپێندرا، واتە یەکەم هاوکار و بەسەرخەر بۆ کاری سیاسی و دەعەوی ئافرەتە، ئێستا ژیان گۆڕاوە، زۆر شتمان لەبارەی ئافرەت گوت وەك فیقە، دوای واقیع پێی هەڵوەشاندینەوە، چۆن؟ وەڵامی مروڤ بەدرێژایی هاتنی بۆ سەر زەوی هەڵبەز و دابەز، هەوراز و نشێو، پێشکەوتن و دواکەوتن ، دەشت و دەر، ژیار و شارستانیەت، جەهالەت و ڕۆشەنبیری جۆراوجۆری بەخۆیەوە بینیوە. هەر سەردەم و زەمانێك

بەشێوازو جۆرێکی جیاواز ژیاوە، کەمتر وایە سەردەمەکان کۆپی یەکتر بو بن، بەڵکو جیاوازیەکی یەکجار زۆری لەگەڵ سەردەمی پێش خۆی، یان دوای خۆی هەبوە، بۆ هەر سەردەمێك کۆمەڵێك داخوازی نوێ و پێویستی ژیان زیادی کردوە، کە لەپێشدا پێویستی پێ نەبوە، یان هەر بونێ نەبوە، هەمو قۆناغەکانی مرۆڤیش پێویستیان بە ئەحکامی شەرعی و حەڵاڵ و حەڕام هەبوە، تا مرۆڤ بزانی کامیان باشە و دروستە، وە کامیان خراپە و نادروستە تا لێی دوور کەویتەوە، ئەمەشیان بەهیچ شێوەیەك بەعەقڵی مرۆڤ بەتەنها دیاری ناکرێت، بێگومان دەبێ نەقڵ دیاری بکات، واتە خودای پەروەردگار وە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)، دەقەکانی قورئان و سونەت زۆر بە تەفاسیلی بە درێژی باسی ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان (خودا و مرۆڤ و گەردون و ژیان) ی کردوە، تەنها شەریعەت سەت لەسەت دەزانی سود و قازانج و چاکەی مرۆڤ لە چیدایە، بۆیە بەڕای بەندە شەریعەتی خودا بۆ هەمو سەردەمێك هەر چەندە جیاوازی ژیانی تێدابی، ژیار و شارستانیەت لە لوتکە بێ، ئەحکامی شەرعی بۆ داناوە، پڕ بە پێستی ژیانی پێشکەوتن و ئاسودەیی و ڕەفاهیەت و خۆشی، بۆیە هەتا لە چوارچێوەی شەریعەتی خودا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دا بمێنیتەوە گرفت بو تاکەکان دروست نابێ، بەشداری تەواوی پێشکەوتنی ژیان دەکات، بەڵام هەر کات هاتە سەر تێگەیشتنی مرۆڤەکان، بێگومان مرۆڤ بەگشتی ڕوڵەی ژینگەی سەردەمی خۆیەتی و ناتوانێ بۆ دوای خۆی بڕیار و فەتوا بدات، تەنها بۆ سەردەمی خۆی نەبێ، کە گوازراوە بۆ سەردەمی دوای خۆی ئەوە ئەو کات گرفت بۆ ژیانی بەشێك لە مرۆڤەکان دروست دەبێ، ناتوانن وەك پێویست بەکاروباری خۆیان هەڵسن، ئینجا بەنەزانی قسە لەسەر ئیسلام دەکرێت، گوایە ناتوانێ بۆ هەمو سەردەمێك داڕێژەری ژیان بێت، لەنێو ئەوانەدا ژن لە ژیانی خێزانی هاوچەرخدا کۆمەڵێك گرفت لەبەردەمی دایە، کە ژیانی هاوچەرخ بەسەر هەمومانی سەپاندوە، ناچاری کردوین لەگەڵی بژین، لەناویاندا ژیانی ژنان، ژیانی هاوچەرخ خێزانی دەستە جەمعی نەهێشتوە، جاران هەر چەند خێزانێك لەیەك خانو دەژیان و پێداویستی ژیانیان کەمتر بو لەم ڕوو، بۆیە پێویستی نەدەکرد ژن بە دەگمەن نەبێ کار بکات، بەڵام ژیانی هاوچەرخ و عەولەمە و پێداویستی زۆر، ژنیشی ناچار

کردوە بەشداری پەیداکردنی بژێوی ژیان بکات، بە تایبەتی دونیای ئەمڕۆ کومەڵێك رەفاهیەتی ژیانی هێناوەتە ئاراوە، هەتا خێزانە مولتەزیم و ئیسلامیەکانیشی ڕاکێشاوە، ناتوانن لەم ژیانە مۆدێرنە داببڕێن، ژن لە ژیانی هاوچەرخدا ڕوبەڕوی ژیانی مۆدێرن بۆتەوە، ژن سوارچاکی مەیدانی سیاسەت و دبلۆماسی و ڕاگەیاندن و مامۆستایەتی و پەرستاری و ڕاگەیاندن و کاری سیاسیە، ژن لەگەڵ کۆمەڵگا بەناچاری دەبی سواری فڕۆکەو شەمەندەفەر و پاس و میترۆو ترام وایی و تکسی بێت! ژن لەباخچەی ساوایان و قوتابخانەی بنەڕەتی و ناوەندی پەیمانگا و زانکۆکان دەبی شان بەشانی پیاو بێ!!! هەروەها لە زۆربەی فەرمانگە حکومی و ئەهلیەکان ژن بەشدارە!!! ژن بەشدارە لە بازاڕ و گەشت و سەفەر کردن و لەبەر کردنی جل و بەرگی مودێرن و...!!! ژن بەشدارە لەشاشەکانی تیڤی و سۆشیال، ڕۆژانە هەمو تاکێك بەدیاریانەوە دادەنیشی و کەس نیە لێی بەدەر بی!!!

ساڵانە کە بۆنە ئاینی و بەهارو نەتەوەییەکان دێت، تەنانەت مەلا و سەید و شێخ و بەرپرسە ئیسلامیەکان، لەو ڕۆژانە بەخێزانەوە دەردەچن تێکەڵی خەڵك دەبن، بەسەعات ئێواران ڕێگایان لێ دەگیرێ لەبەر زۆری خەڵك، ژن لە هەموی بەشدارە، ژیانی هاوچەرخ لەخواردنگەو شوێنە گشتیەکان و پارکەکان وای کردوە خێزانەکان لە ڕوکنێك دابنیشن نان بخون، منداڵەکان ببەنە پارکەکان و بەدیاریانەوە بوەستن، جگە لەمانەش ئێستا مۆسیقا و سرود بۆتە بەشێك لە ژیانی هەموو تاکەکان بەژنانیشەوە، واتە ئێستا مۆسیقا تەنها بۆ گۆرانی و سرود بەکارنایێت، ئێستا مۆبایل و دەرگای سەیارە و کۆمپیتەرو ئامێرەکانی یاری منداڵان و بەشێك ئامێَری تەندروستی و ئەندازیاری هتد بۆتە مۆسیقا، هەروەها تۆپی پێ و یاریەکانی تر هەمو ماڵێکی گرتۆتەوە، تەنانەت ژنیش بونەتە داکۆکیکار و بەشداری دەکات، ئەمانە و هەزار شتی تر کە دونیای عەولەمە و جیهانگەرایی فەرزی کردوە بەسەرماندا، سەرەڕای ئەمانە لەهەموان زیاتر تۆڕی کومەڵایەتیە، کە هەر تاکێك بەژنانیشەوە ئەکاونتێکی تایبەتی خۆی هەیە، ئینجا لە نەوەدەکان دەرس لە پشت پەردە بەژنان دەگوتراوە ئێستا بەخۆمان و خێزانمان وێنە دەگرین لەسەر تۆڕی کومەڵایەتی بڵاوی

دەکەینەوە، کەواتە دژبەیەکی و بەر یەککەوتن زۆر هەیە لە ژیانی کۆن و نوێماندا، بەدڵنیاییەوە ، لەم (٢٠) ساڵەی ڕابردو بەهۆی کاریگەری نامیلکەکانی وڵاتی سعودیا و بانگێشەی سەلەفیەت بەپاڵپشتی ئەم وڵاتە، بە هەزاران نامیلکە و فەتوا لەسەر بابەتی ژن هاتە کوردستان، کاریگەری لەسەر ڕەوشی ژن دروست کردو ژنی گۆشەگیر کرد، نەی هێشت بەشداری لەکاری سیاسی و دەعەوی بکەن، ئەمەش کاروانی سیاسی ئێمەی ئیسلامی زۆر بەپاش خست.

لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ژن لەسەرەتاوە بەشداری لەهەمو کایەکانی سیاسەت و دەعوە و جیهاد کرد، زیاتر لە (٤٠٠) کیلۆمەتر لە جەزیرەی عەرەب لەناو چەنگ و جیهاددا بەشداربوو، برینی سەحابەی تیمار دەکرد، مەفرەزەی تایبەت بون بۆ دیفاع لەتەك پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، لە دەعوەو بانگەوازی و هەنگاوەکانی پێك هێنانی دەوڵەت و ڕاوێژکاری پشکی سەرەکیان بەرکەوت، لەکوردستان لەپشتی پەردە دەرسیان پێ دەگوترا، هاوشان لەگەڵ پیاوان بەشداری کاری سیاسی و دەعەوی و دەوڵەتداریان پێ نەکرا، تاقۆناغەکە تێپەڕی، ئێستا لە فەتواکانی خۆمان پەشیمان بوینەوە، بە هۆکاری تێگەیشتن و پێداچونەوەی خۆمان نا، بەڵکو واقیع پێی سەلماندین ئەم هەنگاوانە واقیعی نین و پێداچونەوەی دەوێ، دەبێ ئافرەت لە ژیانی سیاسی بەشدار بێ.

چارەسەر :

گرفتی بەشداری پێ کردنی ئافرەتان لەکاری بانگخوازی و سیاسیدا، بۆ فەتوا و بوارە فقهیەکان دەگەڕێتەوە، فەتوا بە پێی زەمان و مەکان دەگۆڕێت، چونکە تێگەیشتنی مرۆڤەکانە بەپێی ئەم واقیعەی تێیدا دەژین، لەچوارچێوەی دەق و یاسا شەرعیەکان، ئەم ڕاو و بۆچونانەی لە فەتواکانی ئێستای سعودیە هاتوە، بەشێکی کاریگەری دەسەڵاتی سعودیای لەسەرە، لەکۆتاییدا لێی پەشیمان بونەوە بەهۆکاری سیاسی، گوتیان ئێمە لە ژێر فشاری ئەمریکا بڕیاری سەلەفی بونمان داوە[١]، زانایانی

---

(١) محمد بن سلمان لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆست) دەلێت سەلەفیەتمان

کوردستان لە ژێر ڕۆشنایی دەقەکانی قورئان و سونەتی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)، دەیانتوانی چارەسەر و نەخشە ڕێگا بۆ کاری سیاسی و دەعەوی ئافرەتان دیاری بکەن، هیچ بەریەککەوتن نیە لەشەریعەت لەگەڵ بەشداری ژن لە ژیان، تێگکیرانەکە ئێمەین لەگەڵ مێژو دەژین، بە بڕیاری سەدەکانی پێش خومان بۆ ئەمڕۆ بڕیار و فەتوا دەدەین، ئەگەر زانایەکیش جورئەت بکات، بڵێی هەڵەین پێویستمان بە دوبارە پێداچونەوە هەیە، ئەوا هەر خەڵکی دیندار بۆ ئەوەی لە هەڵەکانی خۆیان پەشیمان نەبنەوە، یان دان بەهەق نەنێ، ڕێك دەست دەکەن بە تۆمەت بەخشینەوەو تومەتبارت دەکەن، بە موعتەزیلە و خەواریج و هەڵگەڕاوە، بەڵام موسڵمان نابێ لەبەر لۆمەی لومەکار حەقیقەت و ڕاستی لە خەڵك بشاریتەوە، چونکە شاردنەوەی حەق تاوانەکەی گەورە ترە ، بۆیە بۆ تەواوی تێگەیشتنەکانمان دەبێ پێداچونەوە بکەین، هەڵێنجاندنی ورد لە قورئانی پیرۆز و سونەتی پیرۆزی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)، بکەین. تا، نەسەر لەخۆمان بشێوێنین، نە ئەم دینە جوان و عەزیم و گشتگیرە ناشرین بکەین. دوای چەندان ساڵ لە ململانێمان لەگەڵ بابەتەکانی ئافرەتان و فەتوادان لەم بارەوە، بەشدار بن یان نا؟ سیاسەت بکەن، یان نا؟ بێنە سەر شاشە و ڕاگەیاندن، یان نا؟ بچنە پەرلەمان یان نا؟ بچنە دەرەوە بۆ کاروباری دەعوە یان نا؟ فەتوای بەحەڕام بونی زۆر لەم حالەتانەمان دا، دواتر زەمەن و واقیع وردە وردە پێی هەڵوەشاندینەوە، ئێستا زۆر ڕێگەی سروشتی شەرعی خۆی وەرگرتوە، بەڵام بەداخەوە دوای پاشەکشە و زەرەرێکی زۆر لە سیاسەت و دەعوە، بەتایبەتی لە شوێنی کەڵە ئافرەتانی دیندار، ئافرەتانی عەلمانی شوێنیان گرتەوە و هەنگاوی خۆیان نا.

---

هەڵبژارد لەژێر فشاری ئەمریکا. واتە سیاسەت بو نەك قەناعەت.

## گرفتی پازدەم: دەمارگیری حیزبی

نابێ ئەوە لەبیر بکەین جیهانی ئیسلامی پێویستیەکی زۆری بە حیزبی ئیسلامی هەیە، ئێستا تاکە وەسیلەیە بۆ جێبەجێ کردنی پڕۆژە دادگەریەکەی ئیسلام، هەروەها تاك و کۆمەڵگا سودێکی زۆری لە بونی ئەم کاروانە پڕ خێرەی ڕابوونی ئیسلامی بینیوە، وشیار بۆتەوە و زۆر هەنگاوی باشیان پێشکەش بەمرۆڤایەتی کردوە، بەتایبەتی خەڵکی موسڵمان، بەڵام لەبەر ئەوەی سەرهەڵدانی حیزبی ئیسلامی لەکوردستان حاڵەتێکی تازە بو کۆمەڵێك وتاری پاڵپشت بە ئایەت و فەرمودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەکار هات بۆ دروست کردنی وەلاء بۆ حیزبی ئیسلامی، تێکەڵکردنێکی زۆر لە نێوان فەتوای دەوڵەتداری لەگەڵ فەتوای دەستەو حیزبایەتی دا کرا، وەلاء بۆ دەستەو جەماعە و حیزب، وەك ولاء بۆ دەوڵەتی ئیسلامی و خەلیفەو ئومەی ئیسلامی تەماشاکرا، واتە فیقهی دەوڵەت تێکەڵ بە فەتوای جەماعەو حیزب و دەستە کرا، ئەمەش بەپێوەری شەریعەت هەڵەیە، بەم شێوازە گوتارانە دەمارگیری بۆ حیزب و کەسی یەکەمی حیزب پەیدا بوو، بەناوی تاعەتی ئەمیرو جەماعە هەتا دوایی، وەلائیان بۆ جەماعەت بە واجب دانا، دور کەوتنەوە لە حیزب بە تەفرەقە حیساب دەکرا، ئەم جۆرە تێڕوانینانە لە لای ئەهلی زانست قبوڵ نیە، بانگێشەی گەورە کردنی حیزب زیاد لە پێوەری شەرع دەمارگیری دروست دەکات، تا وای لێ هات هەر دەستە و حیزبێك خۆی بەتاکە جەماعەی ڕاست و خاوەن حەق دا بنێت، ئەوانی تر بەهەڵە، لە جیهانی ئیسلامی چەندان جەماعە و حیزبی ئیسلامی هەیە، ناکرێ تەنها خۆت بە ڕاست دابنێ، ئەوانی تر هەموی بە گومڕا و دەرچو لە قەڵەم بدرێت، دەقەکانی (واعتصموا) یان بۆ بخوینیەوە، بەم هەنگاوانە سەرۆك و ئەمیندار و ڕابەرو ئەمیرو کەسی یەکەم لەگەڵ حیزب بەرە و پیرۆزی و دەمارگیری دەڕوات، وەك دەردێکی کوشندە ئێستاش هەر ماوە، دەمارگیری بەرگری لە هەڵە دەکات، هەڵە ببینن بێ دەنگن. ئەوەی هەڵەیان لێ بگری، یان ڕەخنەیان لێ بگری بە بەکرێگیراو و خائین وەسفی دەکەن. گۆشتی خێر تەنها بۆ ئەندامەکانیان دابەش دەکەن، کەناڵەکانیان تەنها بۆ ئەندامەکانیان کراوەیە، تا وای لێهات ژن و

ژن خوازیش نەدەبو لەگەڵ حیزبێکی تری ئیسلامی بکرێ، تەنها لەبەر دەمارگیری حیزبی، ئەم جۆرە دەمارگیریە کەسانی نەزان و نەخوێندەوار بەپێش کەسانی خاوەن ڕیساله و پسپۆری دەخات، حیزب والیَ دەکەن خەڵکانی بێ توانا و بەرژەوەندی خواز دەخەنە سەرەوە، خەڵکانی خاوەن پەیام و ژیری دەخەنە دەرەوە، وەك ئێستا دەیانبینین. ئەم دەمارگیریە کەسی یەکەم بە هەمو هەڵەکانیەوە دەهێڵنەوە، لە ڕۆژی دروست بونی تا ئەم حیزبە ماوە، وادەزانن هەمو خەڵك نەزان و نەفام و تاوانبارە تەنها سەرۆکەکەی ئەو نەبێ هەمو کارەکانی تەواون، خەڵك گشتی لەسەر هەڵەن، هەڵەش بکات و ناعەدالەتی بکات، هەر بێ دەنگە و قبوڵیەتی. ئەم جۆرە دەمارگیریە ڕەوشتێکی تری نارێك لە نێو کاری ئیسلامی پەیدا دەکات، ئەویش موجامەلەو تەمەلوق کردنە، ئەم جۆرە ڕەوشتە زەربە لەکاری ئیسلامی دەدات، موسڵمانان باجەکەی دەدەن، ئەویش شوێنی خۆی پێ خۆش دەکات، بەداخەوە ئێستا موجامەلە لەسەر حیسابی دەعوەو کاری ئیسلامی لەنێو نوخبە و کەسایەتیەکانیش پەیدا بوە، پێ لەویژدانی خۆی دەنێ، تەنها بۆ ڕازی کردنی سەرۆك و پێشەواکەی، دەشزانی ئەمە ڕاست نییە و زوڵمی تێدایە و خزمەت بەدین و موسڵمانان ناکات، بەڵام لەبەر بەرژەوەندی خۆی هەر دەیکات. لەبەر دەمارگیریەکەی ئەگەر بۆی بلوێ ئایەت و فەرمودەش تەئویل دەکات، لەسەر ئەم دەمارگیریە، لەگەڵ موسڵمانان وەلائو بەرائی دیاری دەکات. ئەوەی لەگەڵ ئەم حیزبەی ئەو بێ برایەتی، ئەگەر نا نا، ئەمەمان بەکردار بینیوە لەنیو حیزبەکان، لەکاتی تەنها یەك ئیجتیهادی سیاسی جیاواز، چ جنێو و شەڕە فیس بوك و بوهتانیان لەگەڵ یەك کردوە، ئەوەندە لێك دەخوێنن، لەوانەیە لەگەڵ عەلمانییەکان بەم ئەندازەیە لێك نەخوێنن.

چــارەســەر :

هۆکاری دروست بونی دەمارگیری ئەوەیە ئەندامانی حیزب چەندەها ساڵ وتاریان بۆ دەدرێت، ئەوان تەنها گوێگرن، قۆناغەکەش قۆناغی گفتوگۆ و نیقاش نییە، هەمو قسەو گوتارێکیش ئایەت و فەرمودەی بۆ دەهێندرێتەوە، هەمو شتێکی لێ

دەبێتە پیرۆز، بێگومان ئایەت و فەرموودە پیرۆزە بەڵام قسەی کەسەکان تێگەیشتنە لە دەقەکان، ئەوەی بۆ ڕون ناکرێتەوە، بەڕاست و هەڵەوە وادەزانی پیرۆزە، لەلای زۆرینەی ئەندامان وای لێ تێدەگات ئەوەی ئەم حیزبە دەیکات هەموی قورئان و سونەتە، بۆیە دەبێ وەك قورئان و سونەت هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەن و دیفاعی لێ بکەن، هۆشیاری ئەوەیان پێ نادرێت، ئەو کردەوانەی ئێمەی سەرکردەی سیاسی دەیکەین دەکرێت هەڵە بێت، هەروەها بزانن کە هەر ئێمە و مەنهەجەکەمان ڕاست نییە بە تەنها، بەڵکو حیزب و خەڵکانی تریش هەن ڕاستن، ڕاستی تەنها لەئێمە کۆنەبۆتەوە. ئاگادار بکرێنەوە دەمارگیری کوێرانە، کردەوەکی سەردەمی جاهیلیە. کاتێك موهاجیر و ئەنسار ویستیان هەر کەس بەسەر دەستە و حیزبی خۆی هەڵبدا، بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی جاهیلی و نەفامی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چارەسەری دەست بەجێی بۆ دانان فەرموی: (دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ )[1]. ئەم جۆرە کردارانە تەنها هۆکارەکەی دەمارگیری کوێرانەیە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زانی ئەم دەمارگیریە ڕیزی موسڵمانان تێك دەدات، کارەساتی گەورەی لێ دەکەوێتەوە، بەرەو ئاڕاستەی نەفامی دەڕوات، دەست بەجێ چارەسەری کرد و بن بڕی کرد، کەواتە سەرکردەکان نابی بێڵن ئەندامانیان بکەونە بەر یەك، شەڕە جنێو دەست پێ بکەن و هەنگاوی نەفامی بگرنە بەر، ئەگەر ڕوی دا سەرکردە دەبێ وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چارەسەری بکات و کۆتایی پێ بێنێ، نەك بەخۆیان لەژێرەوە هانیان

---

(١) بەسەرهاتەکە زۆر نزیکە لەم دەمارگیریە حیزبایەتیە ئێستا لەنێوان چەند حیزبێکی ئیسلامی ڕوودەدات، عن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ -رضي الله عنهما- قَالَ: كُنَّا فِي غَزَاةٍ فَكَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلًا مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَا لَلأَنْصَارِ، وَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ، فَسَمِعَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ: (مَا بَالُ دَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ؟) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ: كَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلًا مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: (دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ). فَسَمِعَ بِذَلِكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ، فَقَالَ: فَعَلُوهَا، أَمَا وَاللَّهِ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. فَبَلَغَ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم-، فَقَامَ عُمَرُ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ النَّبِيُّ -صلى الله عليه وسلم-: (دَعْهُ، لاَ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَه). صحيح البخاري: (٤٥٢٥).

بدەن. بۆیە درێژە بەچارەسەرەکەی نادەم چونکە ئەم فەرمودەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بۆ موسڵمانان بەسە واز لە دەمارگیری بهێنن[١].

مسك:

کۆمەڵێك کەموکوڕی و خاڵی لاوازی تر هەیە بۆ ئەم پاشە کشەیە وەك: لاوازی دیالۆگ بۆ ئیقناع کردنی دەوروبەر و ئەورپا و وڵاتە زلهێزەکان. ترسان لە تومەتبار کردن بەتایبەتی بەئەڵقە لەگۆی خۆرئاوا. ژیان لەوەهمدا. تێنەگەیشتن لە سیاسەتی نێو دەوڵەتی. نەبونی هیچ ڕێکەوتنێك لەگەڵ هاوبیر و دۆست و هاوسۆزەکان. پەند وەرنەگرتن لەهەڵەی جیهانی و دەوروبەر و ناوەخۆ. بەکەمترین بەش ڕازیە. دبلۆماسیەتێکی لاواز. جیاوازی نێوان فیقە و دەوڵەتداری لەکارەکاندا ناکرێ، یان تێکەل کراوە. ناعەدالەتی لەم بەشە کەمەی لەبەر دەستیاندایە، زولمی تێدا دەکرێ و ناعەدالی لەنێوان ئەندامان دەکرێت. نەبونی هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی دادوەری بۆ یەکلاکردنەوەی گرفتەکانی ناوخۆی حیزب. پەڕاوێز خستنی گەنجان. تێڕوانین و بیرۆکەی هەڵە، ئەگەر کرا دەبی من بیکەم، ئەگەر نا با نەکرێ. بەر تەسك کردنەوەی پەیوەندییە کومەڵایەتییەکان. لەوانەیە بڵێن دەبێ ئەمانە زیادەڕەوی تێدا نەکرا بێ، لەوەڵامدا هەر یەك لەم کەم و کوڕیانە بێگومان بە چەندان چار ڕویانداوە و ئێستاش بەشێکیان بەردەوامن. ئومێ دەکەین ئێمە هەڵەبین، گرنگ ئەوەیە کار و پڕۆژەی ئیسلامی بچێتە پێش.

---

(١) الحرکة الاسلامیة رؤیة مستقبلیة اوراق في النقد الذاتي، د. عبدالله النفیسی، لا ٢٦.

# بەشی
# چوارەم

## دەرئەنجام ، چارەسەر، گۆڕانکاری چۆن دەکرێ؟

دوای ئەوەی کاروانی ڕابوونی ئیسلامی لاواز بوو، پەرتەوازەیی و لێکترازان لە ڕێزی کاری ئیسلامی سەری هەڵدا، دەنگی حیزبە ئیسلامیەکان پاشەکشەی کردو ڕۆژ بەڕۆژ ڕو لەکزیە، لەگۆڕەپانی سیاسی و فکری و بانگخوازی پێگەیان لاواز بوو، زۆرینەی کەسایەتی و بیرمەندان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کەپێویستە گۆڕانکاری لەکار و شێوازی کارکردن بکرێت، هەر یەك هۆکارەکانی پاشەکشە بۆ چەند گرفتێك دەگێڕێتەوە، لەکۆتاییدا هەموو گەیشتونەتە قەناعەت کە کاری ئیسلامی پێویستی بەگۆڕانکاری هەیە، بۆ چارەسەرەکەشی جۆرەها پڕۆژە و هەوڵی جیاواز دراوە، هەندێك هەوڵدرا بۆ یەکخستنی حیزبەکان، هەوڵی تر هەبو بۆ یەك لستی لە هەڵبژاردنەکان، هەوڵ هەبوە بۆ یەك لستی ناو پەرلەمان، هەندێك هەوڵ هەیە بۆ دورکەوتنەوە لە سیاسەت و دەست گرتن تەنها بەدەعوە، لەکۆتاییدا زۆرینە بۆچونەکان ئەنجامی نەبو، دەیان دانیشتن و کۆبونەوە و گروپی ئەلکترۆنی دروست بوو، ئەوانیش هەر ئەنجامی نەبو، بەشی زۆری ئەوانەی پڕۆژەکانیان پێشنیار کردوە زۆر دڵسۆزانە پیێ هەستاون، دڵنیام لەلای خودای گەورە پاداشتیان هەیە، ئەم گەنگەشەیە هەر بەردەوامە و نەوەستاوە، ئەمەشیان بێگومان هەنگاوی دڵخۆشکەرن، دەبی پشتگیری لیێ بکرێ و بەرز بنرخێندریێ، دیارە ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە چی بکەین؟؟؟ پرسیارێك سەدان وەڵام هەڵدەگرێ، پرسیارێك زیاتر لە(١٥) ساڵە تاوتویێ دەکرێت لەنێو کەسایەتیە خەمخۆر و دڵسۆزەکان، دەیان ئالیەت و شێواز پێشکەشکراوە، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبیێ بگەڕێینەوە بۆ یاساکانی گۆڕانکاری، لە درێژەی پڕۆسەکانی گۆڕانکاری بەکردار لەمێژوی مرۆڤایەتی، بەتایبەت پێغەمبەران سەلامی خودایان لەسەر، لەنێو پێغەمبەرانیش سەرمەشقی

گۆڕانکاری جیهانی و گشتی، پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)، هەروەها ئەو گۆڕانکاریانەی لەجیهانی ئیسلامی و وڵاتانی ناوچەکە ڕویانداوە، چۆن بوە، بەکام ڕێگا گۆڕانکاریان کردوە، هەندێ بنەمای سەرکەوتن و گۆڕانکاری هەیە ناگۆڕێن و جێگیرن، لە هەمو سەردەم و زەمەنێك جێبەجێیان بکەی هەمان ئەنجامت دەداتێ، گوڕانکاری بەبێ ئەم بنەمایانە نایەتە دی:

١- دەست گرتن بە سوننەن و یاساکانی ژیان، یان بڵێین سونەنی ئیلاهی. جێبەجێ کردنی پێوەرەکانی سونەن و یاساکانی هەنگاوی یەکەمە، بۆ هەر گۆڕانکاریەك دەست پێ گرتنیان گەیشتن بەئەنجامە.

٢- گۆڕانکاری لەخۆتەوە دەست پێ بکەی ، تاك بی، یان حیزب، یان کۆمەڵگا، یان دەوڵەت، ئێمە گرفتام ئەوەیە داوای گۆڕانکاری دەکەین، بەڵام چەند مەترێك لەخۆمانی دور دەخەینەوە و خۆمانی تێدا بەبێ خەتا دەردەکەین، واتا خۆمان ناگۆڕین، پێمان وایە خەتای ئەوانی ترە نەك خۆمان، بۆیە گۆڕانکاری لە موستەحیل نزیك بۆتەوە. یاسایەکی نەگۆڕی قورئان داوامان لێ دەکات گۆڕانکاری لەخۆمانەوە بکەین: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ ﴾[1]. هەر لادانێك لەم یاسایە ئەستەمە گۆڕانکاری بکرێت.

٣- دیدگای ڕون و ئاشکرا و گشتگیر و هەمەلایەن. لە خاڵەکانی سەرەتا بەدرێژی باسی ئەم بابەتە کراوە.

٤- قەزیە و کەیسی گشتی کۆمەڵگا، بەتایبەتی مرۆڤ و شکۆی مرۆڤایەتی تێدا ڕەنگ بداتەوە.

٥- مەبدەئیەت لە کار و، لێبڕاوەیی لە بەردەوامی، وشیاری لە هەنگاونان، دورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی مەبدەئو بۆ بەرژەوەندی.

٦- خیتابێکی ڕون و هاوسەنگ و پڕ ئاراستە.

---

(١) سورەتی الرعد: ١١.

٧- خۆ ئامادەکردن و ئامادەکاری تەواو لەڕوی هێزی مرۆیی و ڕۆحی و جەستەیی و ماددی.

پشت گوێ خستنی هەر خاڵێك لەم بنەمایانە گۆڕانکاری دەستەبەر نابێ.

## گۆڕانکاری لە وەهم و خەیاڵ:

سروشتی هەندێ کەسی ساویلکەو عاتفی وایە چارەسەری گرفتەکان بە تایبەتی کاری سیاسی دەکات بە خەیاڵ و وەهم وەك: مادام ئێمە موسڵمانین و یەك خودا و یەك پێغەمبەر و یەك قورئانمان هەیە، تەواو هەمو شتێك لەسەر سکەی خۆی دەڕوات و گرفتەکان چارەسەر دەبن!!!؟ بۆیە بەردەوام بۆ چارەسەر کۆمەڵێك وەهم و خەیاڵ دەردەبڕن لەوانە: کاکە وەرن با هەمومان پێکەوە کار بکەین و تەواو چارەسەر دەبێت!!!؟. یان وەرن برایەتی ڕاستەقینە بکەین مادام براین پێویست ناکات جیاواز بین لە ڕاو بۆچون وەرن برایەتی بکەین!!؟. یان با حیزبە سیاسیەکان بکەین بەیەك!، مادام هەمومان هەر بۆ ئیسلام هەوڵ دەدەین ئەم جیاوازی و بۆچونەی بۆ چیە!!!؟. یان مادام سەرکردەکان لەوتارەکانیان باسی برایەتی دەکەن، سەردانی یەکتر دەکەن، لێك نزیك بونەتەوە ئیدی تەواو!!!؟ . لەگەڵ هەندێ بۆچونی تر بۆ چارەسەری پاشەکشەی سیاسی. دیارە ئەمانە لە دڵسۆزی و نیازپاکیتیان، خودا پاداشتیان بداتەوە. بەڵام واقیع و سروشت و بیرکردنەوەی مرۆڤ شتێکە و عاتیفەو سۆزداری و سادەیی شتێکی ترە، ئاوڕێك لە مێژو بدیتەوە پێمان دەڵێ ئەو جۆرە بیر کردنەوانە واقعی و عەمەلی نین. ئەوەی عەمەلیە چارەسەری واقیعی بۆ دۆخەکە بدۆزیەوە لە ڕوی سیاسی و فکری و لۆژیکی و سروشتی مرۆڤەکان. بڕیاری سیاسی و دروستکردنی یەکریزی حەزم و جەزمی دەوێ. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وەفات دەکات، دیارە ئەمە کارەساتێکی زۆر گەورەیە، عومەری کوڕی خەتاب ئەم عیملاقە بە چۆك دەکەوێ لەگەڵ هەواڵەکە، لەم کاتە ئەنصار کەپلەی ڕەزامەندی خودایان وەرگرتوە، خەریکی دیاری کردنی کەسی یەکەمی دەسەڵاتن، لەم کات و ساتە، عمر نەی فەرمو با برابین چونکە ئەوان بران، ئەگەر کێشەی سیاسیش هەبێ هەر بران، وەك

ئەوەی ئێمە ئێستا ئەگەر جیاوازیش بیر کەینەوە، حیزبەکانیشمان یەك نەبن هەر براین. دواتر عومەر هەنگاوی کرداری نا، دەستی ئیمامی ئەبوبکری گرت و فەرمووی ئوممەت خەریکە پارچە پارچە دەبێت، بە بەڵگەی شەرعی و عەقڵی و لۆژیکی بە حەزم جەزم کردن لەسەر بڕیار دان، بەبڕیاری سیاسی ئیمامی ابوبکری بەربژێر کرد، یەکەم کەس بەیعەتی پێداو گۆتایی بەکێشەکە هێنا، بۆ؟ چونکە بڕیاری واقعی بوو، خەیاڵ و وەهم نەبوو. دوو حیزب جیاواز لەدیدگای سیاسی بە ئەندازەی (١٨٠) پلە، (٢٠) ساڵە هەر حیزبە و لەسەر ئەم بۆچونانە ئەندامانیان پەروەردە کردوە[1]، ئێستا وەرە بەبڕیارێکی عاتفی تێکەڵی بکە. چۆن بڕیارت پێ دەدرێت؟ چۆن دەتوانی ئەم جیاوازیە فکریە بتوێنیتەوە لەنێوانیان؟ ئەمەش لە خەیاڵ دەچێ، ئەگەر یەکبگرن هەر شکست دەهێنێ، برایەتی کردن مافێکی شەرعیەو ئێمە مادام موسلمانبین هەر براین، حیزبمان، بۆچونمان، کاری سیاسیمان جیا بێ هەر براین، برایەتی جیاوازە لەگەڵ بەڕێوەبردنی کاری سیاسی، ئەگەر هەر یەك لەم پێشنیارە عاتفیانە ئەنجام بدرێت بێ سودە، چونکە دورە لە دیڕاسە و واقیع و لۆژیکی کاری سیاسی.

---

(١) ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبێکی ئیسلامی بڕوای بە دیموکراسی نییە و پێی کوفرە، ئەندامێکی حیزبەکەی تری ئیسلامی دیموکراسی بی باشترین بژاردەیە، ئەم دوو بۆچونە چۆن لەیەك حیزبدا دەتوانن بڕیار بدەن و بەیەکەوە هەڵوێست وەرگرن.

## سێ جۆر ڕێگا هەیە بۆ هەستانەوە و گۆڕانکاری بۆ ئەمڕۆ

بە پێی خوێندنەوەی بەندە بۆ بارودۆخی ئێستای هەرێمی کوردستان و کار و پڕۆژەی ئیسلامی، سێ ڕێگای سەرەکی هەیە، دەتوانین گۆڕانکاری بکرێت و دەرئەنجامی ڕاست و دروستمان دەستبکەوێ.

ڕێگای یەکەم: سەرکردەو کارێزماو قائیدێکی تازە، یان لەبەرگ و بیرو پڕۆژەی تازە، بێتە گۆڕەپانەکە.

جیهانی ئیسلامی ئێستا بەسیستەمێکی عەلمانی بەڕێوەدەبردرێت، پرۆسەکە لەلایەن ئەوانەوە حوکم دەکرێت، ئێمەش کەوتینەتە نێو ئەم سیستەمەو مەحکومین، بە ڕەچاو کردنی ئەم بارو دۆخە پێویستمان بەسەرکردە و کاریزمایەك هەیە بێتە مەیدان، ئەم بنەمایانە وەك پڕۆژەی هەستانەوەو نەهزە پێشکەش بکات و خۆی سەرکردایەتی پرۆسەی گۆڕانکاری بکات، بڕیاری یەکلاکەرەوە، دەورو بەرێکی بەهێز، بڕوابون بە پڕۆژەکە، چاو نەترسانە هەنگاو بنێ، ئەم ڕێگایە دیارترین کاری پێغەمبەران بوە بۆ گۆڕانکاری. بە نمونە: پێغەمبەر یوسف، علیه السلام دیدگای هەبو بۆ گۆڕینی سیستەمی حوکمداری میسر، قەزیە و کەیسی ئابوری کردە چەقی گۆڕانکاری، کۆمەڵگا بەگشتی گرفتی ئابوری هەبو، بەخۆی سەرکردایەتی کرد فەرموی:﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴾[1]. خیتابێکی ڕون و وردی هەبو بۆ ئیقناع کردنی کۆمەڵگا، نەخشە ڕێگای (١٤) ساڵی دانا، هەنگاوی بەعەمەلی نا بۆ جێبەجێ کردنی، لە پڕۆسەی ئابوری دەستی بەگۆڕانکاری کرد، دواتر دین و کۆمەڵگا و دەسەڵاتی گەلی میسری گۆڕی.

- لە جەزیرەی عەرەب بەتایبەتی و جیهان بەگشتی مرۆڤ شکۆی شکابوو، کۆیلایەتی لە لوتکەدا بوو، بازاڕەکان پڕ بون لە فرۆشتنی مرۆڤە کەم دەرامەتەکان، لەژێر هەیمەنەی

---

(١) سورەتی یوسف: ٥٥.

سیستەمی جاهیلی دەفرۆشران، ئازادی تاکەکان لەگۆڕ نرا بوو، ستەمکارەکان دەستیان بەسەر جیهان داگرتبوو، قەزیە و کەیسی ئەو کاتە کۆیلایەتی مرۆڤەکان بو، دونیا تەواو تاریك بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دیدگای ڕونی دیاری کردو فەرموی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾(١) ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾(٢).

دوای دیدگا.

قەزیە و کەیسی کۆمەڵگای ڕاگەیاند: (ابتعثنا لنخرج العباد من عبادة العباد الى رب العباد)، هاتوین تا مرۆڤەکان دەربێنین لە بەندایەتی بەندەکان بۆ بەندایەتی خودا، ئەم ئازادیە لە گوێی مرۆڤەکان بەگشتی و کۆیلەکان بەتایبەتی زرینگایەوە، چاوەڕی ئەم ڕۆژگارەیان دەکرد، سەتانی وەك و بیلال شکۆی خۆی لەم پەیامە دیتەوە، لە کۆیلایەتی ڕزگاری بو، بو بەسەرکردە، خاوەنداریەتی ئەم کەیس و قەزیەیە لەلایەن پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بوە جێگای ئومێد و پشتیان گرتوو خۆیان تێدا دیتەوە و سەریان خست. خیتابێکی ڕون و ئاشکرای هەبو فەرموی: ﴿إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾(٣). بۆ جێ بەجێ کردنی سەرەتا ئامادەکاری ڕۆحی کرد: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ① قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ② نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ③ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ④﴾(٤).

قۆناغی دووەم ئاراستەی ناوچەکەو جیهانی کرد: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ① قُمْ فَأَنذِرْ ② وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ③ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ④ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ⑤ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ⑥ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ⑦﴾(٥). ماڵی ئەرقەمی دانا بۆ دروستکردنی ڕاوێژکار و نوخبە و دەوروبەرێکی بەهێز، خاوەن پەیام و سەرکردەی پێگەیاند، لەسەر شانی ئەوانە دەوڵەتی مەدینەی

---

(١) سورەتی الاعراف: ١٥٨.

(٢) سورەتی الحج: ٤٩.

(٣) سورەتی الشعراء: ١١٥.

(٤) سورەتی المزمل: ١ – ٤.

(٥) سورەتی المدثر: ١ – ٧.

دامەزراند، کۆیلە و ئازاد، گەنج و لاو، عەرەب و حەجەم، ڕەش و سپی، گەورەو بچوك، ژن و پیاو، بەشداریان تێدا کرد، ئابوریەکی بەهێزی دروست کرد بەهاوکاری صەحابەکان، دەسەڵاتی گرتە دەست، گەورەترین گۆڕانکاری کرد. ئەم دوو نمونەیە بەسە بۆ بەرچاو ڕونی و تێگەیشتن لە ڕێگای گۆڕانکاری، ئەم ڕێگایە ئێستاش بەردەستە بۆ کارێزما و سەرکردەیەك بە مانای وشە سەرکردە بێت.

## سەرکردە و کارێزماکانی گۆڕانکاری لە جیهان

بۆ هەموو ڕودان و هەنگاو و گۆڕانکاریەك یاسای تایبەتی هەیە، سەرکەوتن و ژێرکەوتن، پێشکەوتن و دواکەوتن، کۆمەڵێك بنەما و یاسا هەن نەگۆڕن، دەتوانین بڵێین سونەن و یاسا و سیستەمی ژیانن، بەبێ ڕەچاو کردنیان ئامانجەکە بەدەست نایەت، لەنێو ئەوانەدا گۆڕانکاریمان هەیە لە سیستەمی حوکمڕانی، کە لوتکەی بابەتەکانی ترە و زۆربەی بەش و گۆڕانکاریەکانی تر بەستراوەتەوە بەم گۆڕانکاریە، وەك چەترێك وایە، بەشەکانی تر لەژێر خۆی دەگرێت، هەرێمی کوردستان توشی قەیرانی قوڵی سیستەمی حوکمڕانی بوەو پێویستی بەگۆڕانکاری هەیە لەسیستەمی حوکم، بۆ ئەم هەنگاوە هەندێ جار گلەیی لە خەڵك و جەماوەر دەکرێت تا ئەم گوڕانکاریە بکەن، هەندێ جاریش گلەیی لە نوخبەکان دەکرێ، وەك مامۆستایانی ئایینی و ڕۆشەنبیران و ..هتد، لەکاتێکدا بەپێی سونەنی بونەوەر، یان بڵێین سونەنی ئیلاهی، هەروەها سونەنی ژیان، تەنانەت سونەنی واقیعیش هەر دەبێ سەرکردەیەکی کارێزمای سیاسی دەستپێشخەری بکات و سەرقافڵەی گۆڕانکاری بێت، لە پێشەوەی گەل و میللەت و تەنانەت نوخبەش بێت، خەڵك لە پشتیەوە بێت، ئەمە ڕاستیەکی سەلمێندراوە، تاسەرکردەکان نەهاتون و دەستپێشخەریان نەکردوە، میللەتان نەیانتوانیوە گۆڕانکاری بکەن، بەسەدان ساڵ لەژێر دەستەیی و ستەملێکراوی ماونەتەوە، لە کوردستانیش ئێستا پێویستمان بەگۆڕانکاری هەیە لە سیستەمی سیاسی. سەرکردەی سیاسی بۆیە جیاوازە چونکە بەکردار دەتوانی گۆڕانکاری بکات، پارێزبەندی یاسایی و سیاسی هەیە و خەڵك ئەو بەفریادرەس دەزانن بۆ دەربازبونیان لە قەیرانەکان، بەتایبەتی گۆڕانکاری لە سیستەمی حوکمڕانی.

وێنەی چەند سەرکردەیەکی خاوەن کردار و دەست پێشخەری لە جیهان کە گۆڕانکاریان کردوە.

١- لەسەروی هەمویانەوە پێغەمبەران (سەلامی خودایان لێ بێ) دەست پێشخەربون بۆ گەلەکانیان و سیستەمی حوکمڕانیان گۆڕیوە؟.

٢- ئابوری ناسی ئەڵمانی (لودفیغ إيرهارت ) بە دەست پێشخەری پڕۆژەی ئابوری، بوە ڕزگار کەری ئەڵمانیا.

٣- ئەو سەرکردەی لەبەر نەبونی قوتابخانەی جێ هێشت (لويس إيناسيو لولا دا سيلفا) توانی بە دەست پێشخەری بەڕازیل ڕزگار بکات.

٤- دەست پێشخەری سەرکردە (أنديرا غاندی) گۆڕانکاری کرد و هیندی ڕزگار کرد.

٥- دەست پێشخەری سەرکردە (نیلسون مانديلا) جنوبی ئەفریقیای ڕزگار کرد.

٦- دەست پێشخەری سەرکردە (مهاتير محمد) مالیزیای ڕزگار کرد و سیستەمی حوکمڕانی گۆڕی.

٧- ڕابەری ئێران (خومەینی) دەستپێشخەر بو بۆ شۆرشی ئێران و گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانی.

٨- (عبدالله گول و ئەردۆغان) دەست پێشخەربون بۆ گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانی لە تورکیا.

٩- دەست پێشخەری سەرکردە (میلیس سیناوی) ئیسوپیایی ڕزگار کرد و سیستەمی حوکمڕانی گۆڕی.

١٠- دەست پێشخەری سەرکردە (فان لين) ڤێتنامی ڕزگار کرد، بوە گەورەترین وڵاتی بەرهەمهێنان.

بێگومان نمونەی ترمان زۆرن پێمان دەڵێن کەگۆڕانکاری لەکاری سیاسی و سیستەمی حوکمڕانی دەکرێت بەبونی سەرکردەیەکی لێهاتو و خاوەن بڕیار و جورئەت.

## ڕێگای دووەم : دروستکردنی بەرەیەك لە گروپ و حیزب و کەسایەتی جیاواز

سیاسەت و گەمەو هونەری سیاسی ڕێکار و شێواز و ئالیەتی جیاوازی هەیە، مێژوی ئیسلامی جۆرەها شێوازی بەخۆیەوە بینیوە، چوارچێوە گشتیەکانیش لە قورئان بۆ ئیدارە دانی کۆمەڵگاو سیاسەتکردن فراوانن، پانتایی زۆر فراوانی بۆ هونەری بەڕێوەبردن بەجێ هێشتوە، ئەوانەی یەك نەمەت و شێواز سیاسەت دەکەن شارەزاییان نیە لەگەمەی سیاسی و بنەما گشتیەکانی سیاسەت کردن، یان ناتوانن دەستپێشخەری بکەن بۆ شێوازی جیاوازی سیاسی، یان هەر لەسەرەتاوە نیەتیان نیە، بەوەندە ڕازین کە هەیە، ئەوەی لەباریاندا بوە ئەوەندە بوە زیاتریان پێ نییە!.

لە جیهان بەرەی سیاسی زۆر دروست کراوە، ئەوروپا و نەتەوە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە ساڵەکانی (١٩٣٠) بەدواوە دەیان بەرەی شەعبی و سیاسی و نیشتیمانیان دروست کردوە، بەرەی گەلی فەرەنسی، بەرەی گەلی ئیسپانی، (١٩٣٦)، بەرەی گەلی هندی ساڵی (٢٠٠٦). بەرەی گەلی تونسی (٢٠١٢)، لەکاتی بەهاری عەرەبی. هەروەها بەرەی تەحریری ئیسلامی مۆرو لەفلبین بە سەرۆکایەتی الحاج مراد ابراهیم لە(٢٠٠٣) دامەزراوە، لەبەحرین و عومان و فەلەستییش دروستکرا. بەرەی یەکگرتوی سینی شیوعی و ڤێتنام ساڵی (١٩٥٥)، هەروەها بەرەی ڕزگاری جەزائیری نمونەیەکی زیندوە، لەساڵی (١٩٨٩) دروست بو بەسەرۆکایەتی عەباس مەدەنی و جێگری علی بن بلحاج، لە لایەن حکومەتی جەزائیری دانی پێدانرا بە فەرمی، بەشداری هەڵبژاردنی (١٢) ی ینایری (١٩٩١)ی کردو سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا، لە (٢٣١) کورسی (١٨٨) کورسی بەدەست هێنا، لە هەڵبژاردنی تەشریعیش بەشداری کردو دیسان سەرکەوتنێکی زۆر بەهێزی بەدەست هێنا، دیارە حکومەتی جەزائیری قبوڵی ئەنجامەکانی نەکرد، بەڵام قسەکە لەسەر شێوازی کارکردنە لە ئێستادا، ئەوەی لەسەر ئێمەیە هەوڵدانە ئەگەر دەسەڵات قبوڵی نەکرد، ئەمە کەم و کوڕیەکە لەئێمە نیە، گرفتی ئێمە ئەوەیە ئەم هەڵەو کەم و کوڕیانەی خۆمان چاك ناکەین، هەر دەڵێین ئەمریکاو دەسەڵاتی عەلمانی لێناگەڕێ، با ئێمە کەم و کوڕیەکانی نێو خۆمان چاك

بکەین، ئەوی تر ئێمە نە لە دونیا نە لە دوارۆژ بەرپرسیار نین، بەڵام ئێستا لە هەردوو لا ئێمە بەرپرسیارین.

دەرفەتی زێڕین لەبەردەست ڕابوونی ئیسلامی دا هەیە، خاوەنی کەسایەتی و جەماوەری خاوەن مەبدەئی هەیە، بۆ دروستکردنی بەرەیەکی پتەو بەناوی نیشتیمان، یان عەدالەتی کۆمەڵایەتی، یان بابەتێکی گونجاو بۆ ئیسلاح و گۆڕانکاری، لەحیزبی سیاسی جیاواز و کەسایەتی سیاسی و جەماوەری جیاواز، بەنەخشە ڕێگایەکی وردو بەرچاو ڕونی، بۆ بابەتێکی تایبەت پەیوەندی بەکۆی جەماوەر هەبێ، خاوەنداریەتی ئەم مەلەفانە بکات کە لەسەرەتادا باسمان کرد. گەورەترین هەنگاوە بۆ گۆڕانکاری لە ئایندەی هەرێمی کوردستان و حالەت و پرۆژە ئیسلامیەکە.

## هەنگاوە سەرەتایی و پێشینەکان و بۆ پرۆژەی بەرەی سیاسی

دیارە بۆ هەر سەردەم و قۆناغ و شوێن و کاتێك پرۆژەکان جیاوازن و گۆڕانکاریان بەسەر دادێت، جگە لە هەندێ بنەما نەبێ، کە ئەساسی و پێویستی هەمو سەردەمێکن بۆ گۆڕانکاری و کاری سیاسی سەرکەوتو، ئەوانی تر دەکرێ بەسەردەم و شوێن و کاتەکان بگۆڕدرێت، بۆ بەرەیەکی فراوانی گۆڕانکاری، یان سەرکردایەتی دەستە جەمعی ئەم بنەمایانە پێویستن و دەبێ هەبن، لەسەرەتا بەدرێژی باسمان کرد لەچوارچێوەی خاڵە لاوازەکان، ئێستا بەکورتی بەخاڵ دیاری دەکەیت:

**١- دیاری کردنی دیدگا:** هیچ هەنگاوێکی بەرەی دەستە جەمعی سیاسی نابێت بەبێ دیدگای ڕون و ئاشکرا و دیار دەست پێ بکات، پرۆژەی سیاسی هەر لەسەرەتاوە پێویستیان بە دیدگای ڕون و ئاشکرا هەیە، وەك هەنگاوی سەرەکی و ئەساسی و پێویست.

٢- دوای دیاری کردنی دیدگا، هەنگاوی دووەم پێویستە، لەسەر بەرەی گۆڕانکاری خاوەنداریەتی کەیس و قەزیەیەکی کۆمەڵگای کوردی بکات، حیزبە کوردیەکانی دەسەڵات لەگەڵ ئەوەی کوردایەتی ناکەن!، بەڵام بونەتە خاوەنی کەیسی کوردایەتی،

هەر لەسەرەتاوە دۆڵی ئەم بابەتەیان لێ داوە و خاوەنداریەتی دەکەن و ڕێکلامی شەو و ڕۆژی بۆ دەکەن.

٣- فراوانی عەقلیەتی سەرکردەکانی ئەم بەرەیە. کاری سیاسی چونکە زۆری ئیدارە و دبلۆماسیەت و حیوار و گفتۆگو و گەیشتنە بە دەسەڵات، ئیدارەی دەسەڵات گۆڕانکاری زۆری تێدایە، بەرزو نزمی زۆر دێتە پێش، بۆیە پێویستی بە عەقڵیەتی زۆر فراوان هەیە، واتا عەقڵیەتی سیاسی دەبی زۆر فراوان بی.

٤- کار لەسەر بابەتە کولیات و گشتگیرەکان بکرێت، دورکەونەوە لە جوزئیات و فروعیات.

٥- ئاگاداربن لە واقعی سیاسی و ناوچەیی و هەرێمی و دەولی. چەند ئاستی تێگەیشتنیان خویندنەوەی واقیعیان بەرز بێ ئەوەندە ئاسانتر بەیەکەوە دەگەنە ئامانج.

٦- خوێندنەوەی بوار و ڕوداوە سیاسیەکان وەك خۆی و لەکاتی خویدا.

٧- دیاری کردنی کات بۆ جێبەجێ کردنی تەواوی پڕۆژە داڕێژراوەکان، کە بەرەکە هەڵی بژاردوە.

٨- گرنگی دان بە بواری دبلۆماسی بە شێوازێکی فراوان، لە چوارچێوەی ناساندن و تەواو کردنی پڕۆژەکانی بەرەی سەرکردایەتی دەستە جەمعی، نەك سەردانی کۆمەڵایەتی، بەڵکو بەهیزکردنی بواری دبلۆماسی بەپێی نەخشە ڕێگاو جێبەجێ کردنی پڕۆژەکان.

٩- بۆ هەمو سێکتەرە قیادییەکان بیتانەیەکی بەهێز پێویستە لەسەر ئەساسی پسپۆری و زانستی.

١٠- دانانی کەسی شیاو لەشوێنی شیاو.

١١- سود وەرگرتن لە هەمو کەسێك کە دەگونجێ.

١٢- سەرکردایەتی بەرەکە بزانێ بەرە و کێ هەنگاو دەنێت.

١٣- سود وەرگرتن لە غەیری خۆیان.

١٤- ئامادەسازی کردن پێش ڕوداو و پێش هاتەکان.

١٥- لێژنەو ئۆپەراسیۆنی تایبەت لەکاتی ڕوداوەکان.

١٦- گوێ نەگرتن لە قسە و قسەڵۆکی خەڵك.

١٧- دیاری کردنی کەسانی خاوەن مەبدەئی و خۆڕاگر لە بازنەی دووەم، واتە جکە لەسەرکردایەتی دەستە جەمعی بازنەی دووەم بکرێتەوە بۆ جێبەجێ کردنی هەنگاوەکان .

١٨- دارِشتنی ستراتیجی ورد و درێژ خایەن، لەبەر ڕۆشنایی دیدگاکە لەلایەن سەرکردایەتی دەستە جەمعی.

١٩- تاکتیکی جێبەجێ کردن. بەپێی نەخشە.

٢٠- دروستکردنی وەحدەی فکری بۆ بازنەی یەکەم، واتە سەرکردایەتی دەستە جەمعی لەسەر کەیس و بابەتێکی کۆمەڵگا یەك بۆچون بن، و یەك دەنگی لەسەر ئەم وەحدە فکریە.

٢١- بەدوا داچون و لێپێچینەوە بۆ سەرچەم هەنگاوەکان.

٢٢- دانانی شێوازێکی نوێ لەکارکردن، جیاوازی لەناو و ناوەڕۆك لەگەڵ ئەوانی تر.

٢٣- کردنەوەی دەرگای ڕەخنە، دانانی ئالیەتێك بۆ ڕەخنە گرتن.

٢٤- بەڕۆحی ئەوە کار بکەی کە پێویستت بە هەمو کەسێکەو کەست لێ زیاد نییە.

٢٥- کردنەوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی سیاسی و فکری بۆ بەرەکە.

## ڕێگای سێیەم: دروست کردنی لیستی هەڵبژاردن.

یەكێك لەم ڕێگایانەی دەتوانی لەنێو سیستەمی دیموكراسی و پەرلەمانی كار بكەی، پڕۆژەی ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی و چاكسازی خۆت بگەینی، هەڵبژاردنە، ڕاستە زۆرترین تەڵەكە و فیڵ و كزی و فزی دەكرێت لەم پرۆسەیە، بەڵام هیچ ڕێگای تر نییە، تا بتوانی مومارەسەی سیاسەتیكی ڕاست و شەرعی بكەی، ئەم سیستەمەی ئێستا هەیە دانانی تۆ نیەو بەدەستی تۆش نیە، ئەوەی لەسەر تۆیە بزانی چۆن تێیدا كەمەی سیاسی دەكەی، پڕۆژە خزمەتگوزاریەكانت پێشكەش بەجەماوەر دەكەی، موتمانە بەدەست دێنی، لیستێك بۆ خزمەتكردن و چاكسازی دروست بكرێت لە كەسانی جیاواز و خاوەن مەبدەئی ڕاست، بە پرۆژەیەكی جەماوەری بێنە نێوكاری سیاسی، بەلیستێكی سەربەخۆ، لە ماوەی ئەم (١٧) ساڵە دەیان لیستی جیاواز لە عێراق لەنێوان شیعە و شیعە یان ئەوانی تر دروستكراوە، بۆ جوان گەمە كردنی سیاسی، كەسایەتی و حیزبی ئیسلامیش دەتوانی لیستی جیاواز دروست بكات، بەكەسایەتی و ناونیشانی جیاوازو نوێ، لەكاتی وەرگرتنی هەر پۆستێك بە پرۆژەی خزمەتی جەماوەری بێنە مەیدان، دیارترین كاریان خزمەتكردنی ڕاستەوخۆی جەماوەری بێت، لە ژێرەوە و لەسەرەوە، بە ئاشكراوو بە پەنهان، خۆنەویست بن، خۆیان لە ئیمتیاز و ڕەفاهیەت بپارێزن، ژێر بەژێری نەكەن لەگەڵ دەسەڵات، بە ماوەیەكی كەم لە ڕێگەی شارەوانی و پاریزگا و جومگەكانی تر، بە مەرجێك بەدەستە جەمعی كار بكەن، زۆرترین موتمانە بەدەست دەهێنن، لێرەش ئەوانەی نایانەوێ گۆڕانكاری بكەن، یان لەكورسیەكەیان دەترسن، دەڵێن ئاخر ڕێگە نادەن گۆڕانكاری بكەین، ئەم پاساوە لە شوێنی خۆی نییە، یەكێتی نیشتیمانی (٥٠) ساڵە لە ساحەی سیاسیە، نەی توانی جێی خۆی لە بادینان بكاتەوە، حیزبی ئیسلامی هەیە نیوەی بادینانی بە دەستەوە بو، تا هەڵەی سیاسی نەكرد، زۆرترین كاری خزمەتی تێدا دەكرد، چەندان نمونەی ترمان هەیە، دوبارەی دەكەمەوە تۆ هەنگاوی خۆت بنێ، كەی نەیانهێشت تۆ بەرپرسیار نی.

# کۆتـــــایی

ئاوەدانی و شارستانیەت و شکۆی مرۆڤ سیما و سبغەی دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی بو له‌١٣ سەدەی ڕابردو، دوای ئەوەی جیهان بەگشتی و جەزیرەی عەرەب بە تایبەتی بەتەواوی شکۆی مرۆڤایەتی لەدەست دابو، کۆیلایەتی گەیشتبوە لوتکە، شارستانیەتی ماددی نەی توانی مرۆڤەکان ئاسودەو ئازاد بکات، تاریکایی سیاسی و دەسەڵاتە یەك لەدوای یەك و جیاوازەکانی ئەم سەردەمە مرۆڤەکانی بردە سەر سەکۆی کڕین و فرۆشتن لە بازاڕەکان، کۆمەڵێك ئیمپراتۆری زەبەلاح لەگۆڕەپانەکە دەسەڵاتیان بەڕێوە دەبرد، لەڕوی مادیەوە هەر یەك خاوەنی گەورەترین شارستانیەت بون، ململانێ شارستانی نێوانیان پەرەی سەندبو، بەڵام ئەم شارستانیەتیە توێژێکی تایبەتی لە مرۆڤەکان لەڕوی مادیەوە بەرەو پێش بردبو، سیستەمی بۆرجوازی داهێنابو، مرۆڤەکانی کردبوە چەندان تەبەقە، ئەم هەمو دەسەڵات و شارستانیەتیە نەی توانی شکۆی مرۆڤەکان بپارێزێ و بیانخاتە نێو لانەی بەختەوەری، جەزیرەی عەرەب خاوەن شارستانیەت نەبو، دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی هات دوو کردەوەی زۆر ناوازە و نەوعی ئەنجامدا، لە پێشدا لەمێژو نەبو، گۆڕانکاری ڕیشەیی لە دەسەڵاتی سیاسی کرد لایەنی ماددی و مەعنەوەی گرتەوە، یەکەم: شکۆی مرۆڤایەتی گێڕاوەو کۆتایی بەکڕین و فرۆشتنی مرۆڤ هێنا، دووەم: کۆڕبەندێکی شارستانی دروست کرد، پێنج شارستانیەتی جیاوازی لەم کۆڕبەندە خڕ کردەوە بۆ خزمەتی مرۆڤ، لەوانە شارستانیەتی ڕۆم و فارس و میسری و سین و سند، بەمە کۆتایی بە ململانێ شارستانیەت (صراع الحضارات) و تێکگیرانی شارستانیەت (صدام الحضارات) هێنا، هەروەها دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی بۆ هەمو دونیای سەلماند توانای هەیە بینای شارستانی بکات و تێکگیران لەگەڵ پێشکەوتن و شارستانیەت و ئاوەدانی و مەدەنیەتی سەرجەم جیهان ڕونەدات، بۆ جیهانی سەلماند دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی جیاوازە لە دەسەڵاتەکانی تر، بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیە، نەك بۆ بنەماڵە

و خێزان و تاکەکەسەکان، دەبێ حیزبی ئیسلامیش لەم قالبە تەسك و چوارچێوەدراوە بێتە دەرێ و تەکانی ئاوەدانکردنەوە و شارستانی بدات، لە چوارچێوەی ئیجتیادی سیاسی و شەرعی وەك ئەوەی لە ڕابردو کرا، بنەماکانی ئازادی و دادپەروەری و شورِا بەتەواوی لە خۆی بێنیتە دی پێشی هەمو هەنگاوەکانی، لەوەیشەوە گرنگی بەلایەنی ڕۆحی و ماددی بدات و گۆڕانکاری ڕیشەیی بکات لەپێناو دین و خەڵك و نیشتیمان. ئەوەی لەئێمەی ئیسلامی چاوەڕواندەکری زۆر زیاترە بەداخەوە، نەمانتوانی لەجێی متمانە و گومانی ئەم خەڵکە بین، هیوادارم ئەم نوسراوە تەکانێکی فکری و سیاسی و ستراتیجی بی بۆ داهاتوی کاری ئیسلامی.

٢٥-٢-٢٠٢١. هەولێر

## سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز.

٢- صحیحی بوخاری.

٣- صحیحی موسلیم.

٤- سوننی ترمزی.

٥- سونەنی ابن ماجه.

٦- سونەنی ابوداود.

٧- سونەنی نسائی.

٨- مشکل الاثار.

٩- المعجم الأوسط.

١٠- مسند الامام احمد.

١١- الطبقات الکبری.

١٢- سیره ابن هشام.

١٣- الخراج لابی یوسف.

١٤- عیون الاخبار لابن قتیبه.

١٥- مقامات العلماء بین یدی الخلفاء والأمراء.

١٦- أثر العلماء في الحیاة السیاسیه في الدولة الأمویة.

١٧- السياسة بين الأمم ، هانس مورغنتاو.

١٨- موسوعة العلوم السياسة.

١٩- البحر الرائق، ئيبن نجيم.

٢٠- أضواء على التجربه النيابيه الاسلامية فى لبنان، فتحى يكن.

٢١- الحركة الاسلامية من المواجهه الى المراجعة، كمال السعيد حبيب.

٢٢- مقاصد الشريعه الاسلاميه لطاهر بن عاشور.

٢٣- الشفا بتعريف حقوق المصطفى قاضي عياض.

٢٤- الربيع الاول قراءة سياسيه واستراتيجيه في السيرة النبوية، وضاح خنفر.

٢٥- كيف تصبح قائدا ناجحا، ويليام هو وات.

٢٦- الحركه الاسلاميه فى السودان، مدخل الى فكرها الاستراتيجى والتنظيمى، محمد مختار الشنقيطى.

٢٧- مراجعات الإسلاميين، دراسة في تحوڵات النسق السياسي والمعرفي، بلال التليدى.

٢٨- ومراجعات الإسلاميين في الميزان، مقالة، خليل العنانى.

٢٩- چاوپێکەوتنێکی د. عبدالله نفیسی لەگەڵ کەناڵی (كاظمية). لەبارەی ستراتیجیەتی ئەردۆغان.

٣٠- الملامع العامه للفكر السياسى الاسلامى، د. طارق البشرى، في كتاب الحركه الاسلامية رؤية مستقبلية اوراق في النقد الذاتي، د. عبدالله النفيسى.

٣١- رعاية النابغين فى الاسلام وعلم النفس.

٣٢- الطبقات الكبير، لزهرى.

٣٣- اعداد القاده رويه دعويه معاصره، تێزی دكتورا.

٣٤- القيادة وقت الازمات، دانى كار ينبعى.

٣٥- الدوله الأموية. الشيخ محمد الخضري.

٣٦- موسوعة العلوم السياسية.

٣٧- الطرق الحكمية.

٣٨- مجموع الفتاوى ابن تيميه.

٣٩- فقه الدوله للقرضاوي .

٤٠- الإدماج السياسى للقوى الإسلاميه بالمغرب.

٤١- الاسلاميون ونظام الحكم الديموقراطي، اتجاهات وتجارب، المركز العربى للأبحاث و دراسة السياسات، مجموعه مؤلفين.

٤٢- نظام الإسلام الحكم والدولة، محمد المبارك.

١- مراكز البحث العلم: نظرة في النشأة والغايات، د.صالح محمد زكى، ويوجد على الرابط ادناه:- http://www.arrafid.ae/arrafid/p5_8-.

٢- مراكز الأبحاث بين صناعة الأفكار وترشيد السياسات، عباس أبو غانم، اسلام أون، تموز/يوليو ٢٠٠٥، ينظر الرابط. الآتي: http://www.onislam.net/arabic/madarik/culture-ideas/96738-2005-07-12%2017-42-25.html.

٣- مراكز الدراسات واثرها في ادارة الإستراتيجية الإقليمية: دراسة في برنامج الأمن والدفاع للإتحاد الخليجي، د.حسين علاوي خليفة، ينظر الرابط الآتي: http://www.iasj.net/iasj?func=fulltext&aId=94824

٤- دور المراكز الأبحاث والدراسات في صنع القرار السياسى: ايران نموذجا،٢٠١٥.

٥- د. شاهر إسماعيل،دور مراكز الدراسات في صنع السياسة الخارجية الامريكية، ٢٠١٥.

٦- البناء العلمى واهمية مراكز الدراسات والبحوث، د.كاظم البطاط.

٧- صنع القرار السياسي في منظمات الإدارة العامة ، القاهرة ، مطابع الهيئة المصرية للكتاب، السيد عليوه، ١٩٨٧.

٨- مراكز الأبحاث وصنع السياسة الامريكية في القرن الحادي والعشرين، شبكة المعلومات العالمية : متاح علي الرابط: http://www.siironline.org/alabwab/de-rasat(0)/.33htm.

٩- دور مراكز الدراسات في صنع السياسة الخارجية الأمريكية، تاريخ الاطلاع ٢٢/٤/٢٠١٨، شاهر إسماعيل الشاهر، متاح علي الرابط: http://the voice freason.de..

١٠- مؤسسة راند البحثية، جيمس تومسون، علي الموقع الالكتروني:(www.wise-gater.org). مؤسسة راند –المعرفة علي الموقع الالكتروني: /http /www.marefa.org):.

١١- دور مراكز الأبحاث في الوطن العربي: الواقع الراهن وشروط الفاعلية، خالد وليد محمود، المركز المصري للأبحاث ودراسة السياسات، يناير ٢٠١٣.

١٢- مؤسسات الفكر ودورها في صياغة السياسة الخارجية للدولة.

١٣- مركز الامارات للدراسات العربية والقانون، مجلة القادسية للقانون و العلوم السياسية، العدد الثاني. د. بسمة خليل نامق ، ٢٠٠٩.

١٤- مؤسسة راند وصناعة القرار: عبد الله بن سميط، مجلة العصر ٢٠١١ علي الموقع الالكتروني (www.alasr.ws).

١٥- گۆڤاری (المستقبل العربی) ژمارە (١٠٨)، وتاری محمد حسین هیکل، بەناونیشانی (هواجس مستقبلیە) لەزانکۆی قاهیرە پێشکەش کراوە.

# نـــاوەڕۆک

# دیدێکی نوێ بۆ پاشەکشەی

# پڕۆژەی ئیسلامی

**قسەکردن لەسەر پاشەکشەو خاڵە لاوازەکان بۆ؟**

**ڕەخنە گرتن، کارێکی ئاسان و ساکار نییە، بەتایبەتی لەدونیای ئەمڕۆی عەولەمە و، ململانی جیهانی سیاسەت و، شەڕی بەرژەوەندیخوازان لەپەنای سیاسەتکردن، هەروەها خویندنەوە بۆ کاری سیاسیی و دیاریکردنی خاڵی لاواز لەپارتە سیاسییەکان، بێگومان کارێکی زۆر ئەستەمەو، بوێریی و شارەزایی وردی دەوێت.**

**بەڵام ڕەخنە گرتنێك نیاز پاکیی تێدا بێت و، مەبەست و ئامانج تێیدا: بونیاتنان و هەستانەوەو هەوڵدان بێ، بۆ چارەسەریی، دەبێ بەرز بنرخێندرێت، لای ئەو کەسانەی لەوتە جوانەکەی قائید و پێشەنکی سیاسیەتمەداران عومەری کوڕی خەتتاب تێدەگەن، کە دەفەرموێت: (رحم الله امرأً أهدى إلي عيوبي... ڕەحمەتی خودا لەو کەسە بێت، کە هەڵەکانم بەدیاری پێدەدات).**

**وشەیەکی گەورە، مانایەکی فروان، بناغەیەکی بەهێز، بۆ ئەو کەسانەی تێدەگەن و، دەیانەوی پێبگەن و خاوەنی بیرۆکەو پەیامی بەرزو گەورەن.**

**(وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ) فصلت ٣٥.**

**هەرچەندە ئەمڕۆ پێوەرەکان شلەژاون و، بەشێك لەحیزبً و کەسایەتییەکان ئاسان نیە قەبوڵی ڕەخنە بکەن، یان پاساو دەهێننەوە، یان بەلای کەم، خۆیان پێ لەهەموو کەس شارەزا تر دەبینن، یان خۆ بەگەورە زانین نایەڵێ دان بەهەڵەکان دا بهێنن!!! یان بەرژەوەندیی لەوە دایە، کە کارو پرۆژەی ئیسلامیی لەهەرێمی کوردستان بەم هەڵانەدا بڕوات!**

**بۆیە زۆر پێ دڵگران و ناڕەحەت دەبن، بەڵام ئەمانە نابێ ببێتە ڕێگریی لەدیاریکردنی هەڵە و خاڵە لاوازەکانمان، چونکە قسە لەسەر ئەم بابەتە، بەکاری شەرعیی و بەشێك لەدینداریمان دەزانین، خۆشمان بێ پەڵە نین و، بەشێك لەم هەڵانە دەکەوێتە سەر شانی ئێمەش.**


**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com




/TafseerOffice